ڤیکتۆر هۆگۆ



# بێنەوایان

# شاکاری

ڤیکتۆر هۆگۆ

محەمەدی شلماشی
کردویەتی بەکوردی




محمدی شلماشی

له عەرەبیەوە کردویەتی بەکوردی

---

چاپخانەی الحوادث
بەغدا ـ ١٩٨٨

## « وتەیەك »

لە دوا وەرگیڕانی بێسەرپەرشتان چەند دۆستو برادەرێك داوایان لێکردم کە « البؤسا » ش کە شاکاری ڤیکتۆر هۆگۆیە بکەم بەکوردی •

لەوەلامدا ووتم : ئەوە کـــاری نووسەرێـکی کوردیزانی باشی بەلیمەتە ، بەڵام لەلایەك وەك دەڵێن : کەکەس دیار نەبوو ڕەجـــەب سەرپاڵەیەو لە لایەکی تریشەوە ئەوەندە بەڕوان تەسکم بێدڵی وانم پێ نەکراو دەستم کرد بە وەرگێڕانی •

بەڵام وەنەبێ پیت بەپیتم گۆڕیبێ ؟ بەڵکو بوختەکەم وەرگرتووە • تەنانەت لەبەر ئەوەی کە ناوی «کوزیت» بە کوردی جوان نەبوو ، کردم بە «کەزیە» • جا تکایە لەولایەنەوە ڕەخنەم لێ نەگرنو تایەکیتر جوانتری وەردەگێرێ خۆتانی پێوە بخافڵێنن :

محمدی شلماشی

## « پێشەکی دانەر »

تازەمانێك لەسەر بناغەی ڕەسمو یاسا تاوانێکی کۆمەلایەتی • وا بەردەوام بێ ، کەلەوپەڕی پێشکەوتندا چـــەند دۆزەخێکی دەستکرد لەزەویدا پێك بێنێو سەر نوشتی فریشتەیی مرۆڤ بگۆڕێ •

تا کاتێك سێی مەسئەلەی گەورەی ڕۆژ •• نزم بوونەوەی پلەی پیاو بەهۆی دەست کورتیەوە ، بێ‌نرخی ئافرەت لەبەر برسیەتی ، بێ بەرگی و بەرهەلدایی مندال بێچارەسەر وەمێنن •••

تا لە دورترین ولاتی دنیادا دەنـــگی هاواری کۆمەلانی خـــەلك خەفە بکرێ ، یان نەزانینو زەلیلی لەســــەر لاپەڕەی ژیان باقی بن • کتێبێکی وەك ئەو کتێبە بێ بەهرە نابێ •

کانونی دووی ۱۸٦۲ ڤیکتۆر هۆکۆ

## « پیاوێکی ڕاست »

شارل فرانسوامیریبل واعیزو خەتیبی شاری (دینی) عابیدێکی پیر بوو لەو کاتەدا کە قەزاو قەدەر دەستی کرد بەچنینی ئەو چیرۆکە لە ساڵی ١٨١٥ دا هەر بەگەنجی باوکی ژنی بۆ هێناو زۆر بەخۆشی ڕای دەبوارد ، تا ئاگری شۆڕشی فەڕەنسا هەڵایسا ، لەگەڵ ژنەکەی چوو بۆ « ئیطالیا »و لەوێ ژنەکەی تووشی نەخۆشی بوو مرد بەوەجاخ کوێری • کاتێ ئەو هەموو بەڵاو نەگبەتیەی دی کەبەسەر خەڵکدا هاتن ڕووی کردە گۆشەگیری و عیبادەت ، زۆری نەخایاند کرا بە کاهێنی «برینول» و خەریکی نوێژو ڕۆژو بوو ، تەمەنی وەناو کەوت و سەرو ڕیشی سپی بوو • لە ساڵی ١٨٠٦دا بوو بە خەتیبی شاری (دینی)و لەگەڵ خوشك و کارەکەرەکەیان چوون بۆوێ و دەستی کرد بەئامۆژگاری خەڵك • ڕۆژێك چوو سەری لەنەخۆشخانەدا ژوورەکانی زۆر بچووك بوون ، خانوەکەی خۆی کردە نەخۆشخانەو خۆی هاتە ناو نەخۆشخانەکەوە • عەرەبانێکی • تایبەتی بوو ئەویشی کردە وەقف • مەعاشی ساڵانەی پازدە هەزار فرانك بوو ، چواردەی بۆ فەقیرو هەژاران خەرج دەکرد • پارەی لە دەوڵەمەندان دەستاندو بەیارمەتی

دەیدا بە لێ قەوماوان • سەری لەنەخۆشان دەدا • دڵ خۆشی خەڵکی دەدایەوە ، باسی ڕابردوی بۆدەگێڕانەوە • موژدەی دەدا بەوکەسانە کە تۆبەیان لەخەراپە دەکردو ئەوانەی دەترساند کە خەراپەیان دەکردە چرای تاریکی بوو ، ئەوەی ئەو دەیزانیو دەی دیو دەی بیست کەس نەی دەزانی ، تەماعی نەبوو ، خەڵکی شاری (دینی) بەهۆی خواپەرستی ئەوەوە زۆر گەڕابوونەوەو کاری کرد بۆ سەر دڵو دەرونی خەڵكو هەستی خواپەرستی بوژاندبوونیەوە • زۆریان خۆش دەویست ، زۆر دەچوونە خزمەتی • خۆزگە بەو کەسە عەیبی خۆی دەبینێو نایان هێڵێو عەیبی خەڵك دادەپۆشێ • ئا ئەوە بوو شارل میرییل واعیزو خەتیبی شارە بچکۆڵەکەی (دینی) •••

## « شەوێکی درێژ »

ڕۆژ خەریکی ئاوا بوون بوو ، سروەی با شاری (دینی) فێنك دا دێنا ، ئەووەڵی مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی (١٨١٥)بوو ، سەعاتێك بەر لە ڕۆژ ئاوا بوون پیاوێك بە پێ‌خواسی هاتە شارە بچکۆڵەکەی (دینی) • تەمەنی لە دەورو بەری چلو شەش‌و چلو حەوتدا بوو ، کڵاوێکی چەرمی کۆنی لەسەر بوو ، نیوەی ناو چاوانی کە بە گەرماو هەتاو سوتا بوو کڵاوەکە دای پۆشی بوو ، زۆر ماندو دیار بوو ، ئارەقی دەر دا بوو ، سینگە توکاویەکەی لەبن کراسە کۆنە زەردەکەیدا کە بە دوگمەی سپی یەخەکەی داخرابوو دە بینرا • پیاوێکی مام‌ناوندی بوو ، بەڵام بەتاقەت • گڕاواتێکی لوولی لە ملدا بوو ، شەڵوارێکی ڕەنك ئاوی دڕاوی کۆنی سپی بۆوەی لە پێدا بوو ، سەر ئەژنۆیەکی دڕا بوو • کۆتێکی ڕەنك خۆڵەمێشی لە بەر دا بوو ، لایەکی بە پارچێکی سەوز

پینە کرابوو ، کۆڵە پشتێکی بەکۆڵەوە بوو ، عەصایەکی بەدەستەوە بوو ، بێ گۆرەوی کەوشە کۆنی لە پێدا بوون ، مووی لەشی کورت‌و ، ڕیشی درێژ بوو ، گەرماو خۆڵ‌و تۆزی ڕێـگا بێ ئەندازە شەپر زەیان کرد بوو سەری تاشی بوو ، تازە دەهاتەوە • لەو کـاتەدا چـەند کەسێك لە بەرپەنجەرەو بەر دەرگا ڕا وەستا بووو ، بێ موبالاتانەو بە گرژی‌یـەوە تەماشایان دەکرد • تا ئەو کاتە غەریبەیەك بەوحاڵە ڕوی نەکردبۆ ئـەو شارە • کەس نەی‌ناسی ، بەڵام زانیان کە ڕێبوارە • دەیانـگوت : دەبێ لە کوێ‌وە هاتبێ ؟ لەباکورەوە ••• لەوانەیە لە دەریاوە هاتبێ ، چونـکە لەڕێـگایەکەوە هاتە ناو شار کە (ناپلئون) حەوت مانگ لەمەو بەر بەوێدا چوو بوو بۆ پاریس •

بەهەر حاڵ ، کاتێ گەیشتە ناو شار بەولاو ئەولای خۆیدا ڕوانی‌و یەکسەرە چۆ شارەوانی ، لەپاش چەند دەقیقە هاتە دەرەوە ، پۆلیسی بەر دەرگا بە چاوێکی زۆر سەیر تەماشای دەکرد،بۆ سەلام‌و ڕێز لێ گرتن لە پۆلیسەکە کلاوەکەی لەسەر سەر بەرز کردەوە ، بەڵام ئەو بێ ئەوەی وەڵامی سەلامەکەی بداتەوە تا لە بەرچاوانی ئاوابوو هەر تەماشای کرد • کابرای غەریب چوو بۆ میوانخانەو لەدەرگای‌دا ، خاوەنەکەی زانی کـە موشتەری تازەی بۆهات بێ ئەوەی سەری بەرز بکاتەوە گوتی : فەرموو : دەفەرمووی چی ؟ ووتی : خواردن‌و ژورێـکم دەوێ ، خاوەن ئوتێلەکە سەری بەرز کردەوە ، کـە چاوی بەقیافەی کابرا کەوت ووتی : بەڵام بەپارە ، کابرا کیسە باخەڵێکی چەرمی لەباخەڵ دەرهێناو گوتی : ئـــەوە پارە ، کیسەباخەڵەکەی دەباخـــەڵ نایەوەو کۆڵە پشتەکەی دانا ، بەڵام عەصاکەی هەر بەدەستەوە بوو چوو لەسەر کورسی‌یەك لەلای ئاگرەکە دانیشت • کابرای میوانخانە زۆری سەرنج دەدا ، غەریبەکـــە ووتی :

ئەرێ نان حازرە ؟ ووتی : حازر دەبێ • کابرای غەریب پشتی کردبوّ دەرگاو خۆی گەرم دەکردەوە ، خـــاوەن ئوتێلەکە قەڵەمێکی لـەگیرفان دەر هێناو لە پارچە کاغەزێك شتێکی نووسیو دای بە کورێك و بەگوێشیدا چپاند ، کورەکـە سەری ڕاوەشاندو بەرەو شارەوانی ڕۆیشت • کابرای غەریبە ئاگای لەوە نەبوو ، دوبارە بانـگی کرد ئاغا نان حازرە ؟ ووتی : بەڵێ تا چەند دەقیقەی تر حـــازر دەبێ • زۆری پێ نەچوو کوڕەکــە کاغەزێـکی بەدەستەوە بوو هاتەوە • خاوەن ئوتێلەکـــە وەکو ئــەوەی چاوەڕوانی وەلام بووبێ گورج لە دەستی وەرگرت و بەووردی خوێندیەوە• لەپاشان ســەری بەردایەوەو ماوەیەك بێدەنگ بوو ، ئنجا هەستا چـوو بەلای کابرای میوانەوەو ووتی : ئاغا ناتوانم تۆ ڕاگرم : کابرا نەکانێکی داو ووتی : بۆچی لەوە دەترسی پارەم نەبێ ؟ کەیفت لێیە لەپێشــەوە پارەکە وەرگرە •

ووتی : نا بابە زۆرم نیـە بــەکرێی بدەم : میوانەکە لەسەرخۆ گوتی : باشە لەتەویلەی وەلاغەکاندا دەنووم • ـ ناکرێ • ـ ئاخـــر بۆ ؟ ـ چونـکە پڕە لەئەسپ • کوڕە قوڕنێك هەر دەبێ لێی بنـووم • لە چێی خۆی هەستاو هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : ئاخر ئەوا لەبرسـان دەمرم ، لەبەیانیەوە تا ئێستا بەپیـــادە بەڕێدا هاتووم ، دوازدە فرسەخم ڕێـگا بڕیوە • پارە ئەدەم و شتێك دەخۆم • خاوەن ئوتێل ووتی : بڕۆ نان و جێ نیە • کابرا سەری بەردا بۆوە ، ئاگرەکەی تێك وەر دەدا ، خاوەن میوانخانە چێسمەیێکی لێ کردوو گوتی : ئیتر بەسە • دەت هەوێ ناوت بەرم ؟ دەزانم تۆ کێی ؟ هەستە بڕۆ ، تۆ ناوت (ژانوالژان)ە • هەر کە هاتیە ئێرە لێت کەوتمە شکەوە ، نەفەرێـکم نارد بۆ شارەوانی ، ئەوەش وەلامی شارەوانیە • دەتوانی وەی خوێنی • هەر کاغەزەکــەی

لێك كردەوەو لەپێش چاوی كابرای ڕاگرت • تەماشایەكی كردو سەری بەردایەوەو كۆڵە پشتەكەی هەڵگرتو چۆ دەرەوە • كە ئاوڕی دایەوە ئەوەی لـــە وتێلەكەدا بوون هـەمویان لـە خاوەن وتێل كۆ بوونەوەو تەماشای ئەمیان دەكردو بەیەكتریان نیشان دەدا •

زۆر لـە سـەرخۆ دەڕۆیی ، هەوڵی وتێلێكی تری دەدا • چاوی بەچرایەك كەوت لەئاخـری كۆڵانێكدا ترووسكەی دەهات • تابلۆیەكی ئاسن بە لەخـــە دار سنەوبەرێــكەوە هەڵاوەسرا بوو ، ڕووی كردە وێ ، كەچوو (وتێل) بوو ، نەوێرا بچێتە ژوورەوە ، خۆی گەیاندە حەوشەو ، لە دەرگای دواوە چۆ ژوورەوە • خاوەن ئوتێل هەستی پێكرد ووتی : ئەوە كێیە ؟ كـابرا خـۆی گـەیاندە ساڵۆنەكەو گوتی : كاكـــە میوانێكە پێویستی بەخواردنو جێی نوستن هەیە •

ــ زۆر باشە ، تۆ دەتوانی لێـــرە نانیش بخۆیتو بشخەوی •

میوانەكە لە پێش ژورەكە دانیشتو دەستی كرد بە خۆگەرم كردنەوە • بۆنێكی زۆر خۆش لەمەنجەڵی سەر ئاگرەكە دەهاتە بن لووتی ، زۆری پێخۆش بوو •

لە ساڵۆنی ئوتێلەكە كۆمەڵێك دانیشتبوون • یەكیان ماسی گرێك بوو كـــە لەپێشدا ئەسپەكـەی بردبۆ ( وتێلی ) ( لابار )و ئەو ڕۆژە بە ڕێكەوت تووشی ئەو پیاوە غەریبە ببوو ، داوای لێكرد بوو لەپاشـكۆی خۆیەوە سواری كا ، بەڵام وەڵامی نەدابۆوەو پێی پێوە نابوو •

كەچاوی بەكابرا غەریبە كـــەوت ناسیەوە كە ئەوە كـــابرای ڕێـگایەو نیـو سەعـــات لەمـــەوبەر لە وتێلی ( لابار ) دەریان كرد • بەنەهێنی ئیشارەی بۆ خاوەن ئوتێل كردو چوو بۆلایو چەند قسێـكی

بەگوێدا چرکاند • خاوەن (ووتیل) هەستا چوو دەستێکی لەشانی داو بەتوڕەییەوە گوتی : هەستە بڕۆ دەرەوە •

میوان بەهێواشی تەماشـای کردو لەسەرخۆ گوتی : ئاخ وادیارە تۆش دەزانی ؟ ـ بەڵێ لە وتێلەکەی تریش میان دەرکرد • ـ ئێمەش لێرەت دەر دەکەین • کەواتە بۆکوێ بچم ؟ ـ جێگایەك پەیدا بـکە • عەصاو کۆڵە پشتەکەی هەڵـگرتو چۆ دەرەوە ، ئەو منداڵانەی کـە لە ئوتێلی لابارەوە دوایی کەو تبوونو چاوەڕوایان دەکرد دەستیان کرد بە بەرد بارانی ، بەتوڕەییەوە بۆیان گەڕایەوەو بەعەصاکەی پەرتو بڵاوی کردن • ڕۆیی گـەیشتە بەر دەرگـای بەندیخانە • زەنگوڵێك بەزنجیرێـکی ئاسن هــەڵاوەسرا بوو ، زنجیرەکەی گرتو ڕایی وەشاند • کونێك لـە دەروازەکە کرایەوە • بەندیەوان سـەری هێنایە دەرەوە ، بۆ ڕێزگرتن لەبەندیەوانەکە کڵاوەکەی بەرز کردەوەو ووتی : دێڵێ شەو لێرە بنوم ؟ کابرا گوتی : بەندیخانە کاروانسەرا نیە، بچۆ جورمێك بـکە تا دەرگات لێبکەینەوە • کونەکە پێوە درایەوەو بە نائومێدی ڕوی‌کردە خیابانێکی بچووکی‌تر • هەر چواو دەورەی باغ بوو ، پەرژین‌کرا بوو • لەناو باغەکاندا خانوێـکی بچووکی یەك قـاتی چاو پێکەوت ، لە پەنجەرێکیەوە ڕوناکی دیار بوو • چــوو لـەپشت شوشەی پەنجەرەکەوە تەماشای کرد ، ژورێـکی پانو پاكو خـاوێن ، قەرەوێڵەیەك سەر چەفێکی بەسەردا درا بوو ، لانکێك لەگۆشـەیەکەوە دانرا بوو،چەند کورسی دارو تفەنگێکی دو لوولە بە دیوارەوە هەڵپەسێررا بوو ، مێزێك لە ناوەڕاستی دانرا بوو ، چراێکی لەسەر بوو • دیزەیەك هەڵمی لێ بەرز دەبۆوە • پیاوێـکی تەمەن چل‌ساڵە لە پشتی مێزەکـەوە دانیشتبوو ، منداڵێـکی شـیرە خۆرەی لەسەر باوەش بوو هـــەڵی

دەبەڕاند • ئافرەتێکی جـــوان لەنزیکەوە شیری ئەدا بەمنداڵێـــکی بچوکتر : باوکەکە پێدەکەنی ، منداڵەکە پێدەکەنی ، دایکەکە زەردە خەنەدەی دەکردن •

بەسپاوی لەشوشەی پەنجەرەکەی ڕاکێشا • دوبارە لێیدایەوە • گوێی لە دەنـگی ئافرەتەکەبوو بەمێردەکەی گوت : گوێم لەدەنـگێك بوو • گوتی : باوەڕ ناکـــەم • بۆجاری سێیەم لەپەنجەرەکەی داو پیاوەکە لە جێی خۆی هەستاو چراکەی بەدەستەوە گرتو دەرگـــــای کردەوە • پیاوە غەریبەکە گوتی : ئاغا زۆر داوای لێ بوردن دەکـەم ، دەتوانی بە پارە جایێك چێتمتو جێگای نوستنم بکەنەوە ؟

خـــاوەن ماڵ پرسی : تۆ کێی ؟ لەوەڵامـــدا ووتی : ئـەوە دوازدە فرسەخە بەڕێـگادا دێم : خاوەن ماڵ ووتی : هەرکەس پارە بدا جێگای دەکەمەوە ، بەڵام تۆ بۆ ناچیە (ئوتێل) ؟ ــ ئاخر ژوریان نیە • ــ چۆن ژوریان نیـە ؟ خـــۆ نە جـــەژنەو ، نە ڕۆژی بازاڕە ؛ ئەی چویتە میوانخانەی ( لابار ) ؟ ــ بەڵێ • ــ باشە ؟ گورجێك ووتی : نازانم ڕایان نەگرتم : ئەی نەچویتە میوانخانەی خیابانی (شافوت) ؟ ئەوانیش دەریان کردم • خاوەن ماڵ زۆر بێ موبالاتانە سەرنجی کابرای‌داو لە نـــکاو بە توندی گوتی : کەواتە ئەو کەســـــە تۆی ؟ دوبارە تەماشـای کردو تۆپاشەوە گەڕایەوە ، چراکەی لەسەر مێزەکە داناو تاپرەکەی هەڵگرت• ژنەکەی کـە ئەوەی بیست لەترسان هەستا دوو منداڵەکەی لـەباوەش گرتن‌و لەپشت مێردەکەی ڕاوەستاو لەبن لێوانەوە هـــەر دەیـگوت‌و نۆڵەی دەهات :

خـاوەن ماڵ هـــات بە توڕەییەوە گوتی : بڕۆ دەرەوە • کـــابرا هاواری کردو گوتی : بۆ خاتری خوا پەرداخێکم ئاو بدەنێ • ــ ووتی :

فیشەکێك باشترە • ئەوەی ووت‌و تووند دەرگاکەی پێوە دایەوە • شەو دنیای داگرتبوو ، بایێکی ساردی دەهات ، ڕووی کردە باغێکی‌تر پەرژین کرابوو تەماشای کرد لە ناوباغەکەدا لای دەروازەی باغەکە ژورێکی چووك دیار بوو ، چوو بۆلای زۆر تاریك بوو ، خۆی دانەواندو چۆ ژوورەوە • زۆر گەرم بوو ، هێندێك کای لێ ڕۆ کرابوو ، زۆر ماندوو هیلاك بوو ، چوو لەسەر کایەکە ڕاکشا ، بەڵام زۆری نەخایاند دەنگێکی سامناکی هاتە بەر گوێ • سەری بەرزکردەوە چاوی بەسەگێکی گەورە کەوت سەری هێنابۆ ناو ژورەکە • لەبەر خۆیەوە گوتی : دیارە ئێرەش لانەی سەگە • بەگورجی کۆڵە پشتەکەی وەکو سپەر لەپێش خۆ ڕاگرت‌و عاصاکەی بەدەستەوە گرت‌و دەر پەڕی • گـاێ بەزەحمەتێکی زۆر لەوێ رزگاری بوو دوور کەوتەوە ، دوبارە خـۆی بەتاك‌و تەنیـاو دەرکراو ، تەنانەت لەسەر کای لانە سەگەکەش لە خیابان چـاو بێ‌کەوتەوە • لەسەر بەردێك ڕاکشاو بەگریانەوە دەیگوت : تەنانەت وەك سەگێکیش نیم ، لەویش کـەمترم •ئنجا هـەستاو دەستی کرد بەڕۆین • ڕوی کردە دەری شار • بەو هیوایە دارێك ، خـەرمانێك ، پەنایەکی دەست‌کـەوێ لای بخەوێ • ماوەیێکی زۆر بەخەمبـاری ڕۆیشت • کاتێك لای وا بوو لەهەموو ئینسانێك دور کـەو تۆتەوە ، سەری بەرزکردەوەو تەماشـای دەورو بەری خـۆی کرد چۆتە ناو مەزرەعەیەکەوە ، هیچ شتێك نەبوو پەنای بۆ بەرێ • دوبارە بـەرەو شار گەڕایەوە ، دەروازەکانی شار داخـرا بوون • بەهەر چۆنێ بوو چۆوە ناو شار ، سەعات هەشتی شەو بوو ، چونـکە خیابانەکـانی نـە دەناسین بێ مەقسەد دەگەڕا • هـەروەها لە کاتێـکدا بە مـەیدانی نوێژخانەدا دەڕۆیی لە گۆشەیێکی مەیدانەکە چـاوی بەچاپخانەیەك کـەوت • زۆر ماندو مردو بوو ، بەنائومێـدی چوو لە سەر بەردێك لە

پێش چاپخانەکە درێژ بوو • لەو کاتەدا ئافرەتێك لە کلیساکە هـــاتە دەرێ ، چاوی بەو پیاوە کەوت کە لە تاریکیدا ڕاکشاوە ، گوتی : کاکە ئەوە بۆ لەسەر ئەو بەردە ڕەقە ڕاکشاوی ؟ کابرا بە تورەییەوە ووتی : خانمی میهرەبان نابینی چەند ماندوم ؟ ئافرەتەکە گوتی : جا لەسەر ئەو بەردە خەوتووی ؟ کابرا ووتی : من نۆزدە ساڵ لەسەر تەختـــــە دار خەوتووم ، با ئەو شۆ لەسەر دۆشەکی بەرد بنوم • بۆ سەربار بووی ؟ ـ بەڵێ خانم سەربار بووم • ـ ئەی بۆ نەچویە کاروانسەرا ـ ئوتێل ؟ ـ چونکە پارەم نەبوو • ژنەکە ووتی : ئاه ؟ حەیف ! من هەر ئەو چـوار سکەم پێیە • کابرا دەستی درێژ کردو گوتی : بێنە • ژنەکە پارەکـەی دایەو گوتی : بەو پارە کەمە جێگات ناکەنەوە ، بەلام هەوڵت داوە ؟ خۆ ناتوانی شەو ئاوا بژی سەرمات دەبێ‌و دیارە برسیشتە ، دەبێ جێگایەکت بدەنێ • لە هەموو دەرگایەکم‌داوە • ـ باشە چیان وت ؟ هەموو کەس دەری کردم • ژنە میهرەبانەکە دەستی لەشانیداو ئیشارەی بۆ لایەکی تری مەیدانەکە کردو ماڵی واعیزو خەتیبی نیشاندا گوتی : چویە ئـەو ماڵەش ؟ گوتی : نەخەیر • کەواتە بچۆ لە دەرگای وانیش بدە •

## « عەقڵ لە دەست نەدان »

ئەو شەوە واعیزو قەشەی شاری (دینی) لەپاش گەڕان لـــە ناو شاردا ، تا درەنگ لەژورەکەی خۆیدا خەریکی دانانی کتێبێ بوو بەناوی (وەظیفە) سەعات هـەشت کارەکەرەکەیان وەکو شـــەوان هات قـــاپە ئاڵتونەکانی لەسەر تاقەکە هەڵـگرت • قەشە زانی کەنان حازرەو سفرە ڕاخراوەو خوشکەکەی چاوە ڕوانیەتی • کتێبەکەی وێك ناو چۆ ژوری نان خواردن • کارەکەرەکە بەگەرمی لەگەڵ خوشـکی قەشـە قسەی

ئەکرد ، بە تایبەتی باسی دەرگاو پەنجەرە داخستنیان بوو • کارەکەرەکە ئەو شەوە لە خەڵکی بیستبوو کە پیاوێکی سەیری دەر بەدەرو سەرگەردان هاتۆتە ناو شار ، دەیگوت •• ئەوەی ئیمشەو ئاگای لەخۆی نەبێ تووشی بەڵایەك دەبێ ، دەرگاو پەنجەرە زو داخەن • خوشکی قەشە گوتی : کاکە گوێت لە قسەکانیەتی ؟ ووتی : بەڵێ :

ڕوی کردە کارەکەرەکەو گوتی : تووشی بەڵایەك دەبین ؟ کارەکەرەکە ووتی : بەڵێ ئاغا ئیمشەو بەسەرهاتێك لەشاردا ڕو ئەدا • هەموو کەس وادەڵێ : گوتی : قوربان خانوەکەمان قایم نیە ، ئەگەر بفەرمووی : دەچم وەستای قفڵ ساز بانگ دەکەم کلێونەکانمان بۆچاك بکا ، با بۆ شەوێکیش بێ • خۆ جەنابیشت هەرچی لە دەرگای‌دا دەڵێ فەرموو : لەوکاتەدا بە توندی لە دەرگایاندا • قەشە گوتی : فەرموو : وەرە ژورەوە •

# « گردەوێنیکی قارەمانانە »

دەرگا بە توندی کرایەوە ، پیاوێکی غەریبە وەژور کەوت • هێندێك چۆ پێشەوەو ڕاوەستا ، کۆڵە پشتەکەی لەپشت‌بوو ، عەصاکەی بەدەستەوە بوو ، زۆر تورە دیار بوو • کارەکەرەکە کە چاوی پێکەوت ئەوەندە ترسا ، زاری دابچڕی‌بوو بە لەرزینەوە دە کابرای ڕامابوو ، خوشکی قەشەش دەکابرای دەفکری‌و تەماشای کاکی دەکرد، بێ دەنگ ڕاوەستا • قەشە زۆر بەمیهرەبانیەوە ڕوی‌کردە کابراو خەریك بوو پرسیاری لێ‌بکا داخوا کێیە ؟ کابرا لە کاتێکدا خۆی هاویشتبۆ سەر عەصاکەی ، هاتە پێشەوەو یەك یەك تەماشای کردن‌و بێ ئەوەی گوێ

بداته قسەی قەشه ، بەدەنگی بەرز گوتی : گوێتان لێ بێ ! مـن ناوم (ژانواڵژان) حوکم دراوم‌و نۆزده ساڵ له بەندیخانەدا بووم • چوار ڕۆژ لەمەوبەر ئازادیان کردم‌و بەرەو ئەو شاره کەوتمه ڕێ • دوازده فرسەخ بەرێیدا هاتووم ، ئێمشەو گەیمه ئەو شاره • چوومه کاروانسەرا لەبەر ئەوەی پەساپۆرتەکەم زەرد بوو ڕایان نەگرتم • چوومـه کـاروان سەرایەکی‌تر دەریان‌کردم ، چوومه بەندیخانه پۆلیس گوتی : بەندیخانه کاروانسەرا نیه ، خۆم خزانده ناو لانەی سەگێکەوه دەری پەڕاندم • ڕوم‌کرده ناو مەزرعەیەك لەترسی باران دوباره هاتمەوه ناو شار • لەپێش مەیدانی شار لەسەر بەردێك پاڵم‌دایەوه ، ئافرەتێکی ڕوخۆش ماڵی ئێوەی نیشان دام‌و هـاتم •

هەر خێرا پەساپۆرته زەردەکەی لەباخەڵ دەرهێناو گوتی : ئـەوه پەساپۆرته زەردەکەمه • لەبەر ئەوه له هەموو جێگایەك دەرم دەکەن •

قەشه ڕوی تێ کردو گوتی : ئاغا فەرموو : دانیشەو خۆت گـەرم کەوه • تا نان دەخۆین جێگای خەویشت چادەکرێ • کابرا له خۆشیان گەش بۆوەو ئاهێکی هاتەوه بەرو گوتی : ئەوه بەڕاستانه ؟

ڕام دەگرن ؟ وەك ئەوانی‌تر دەرم ناکـەن ؟ قەشه گوتی : مـاڵی خۆته • کابرا خێـرا کۆڵه پشتەکـەی داناو عەصاکەی بەدیوارەوه هەڵپەساردو دانیشت • قەشه ووتی : شەوەکەی سارده تۆش سەرمـاته وەره لای ئاگرەکـه ، دوباره گوتی : ئاغا ماڵی خۆته ، تۆ برای منی ، شەرم مەکه • وادیاره زۆرت ڕەنج‌کێشاوه ! هەناسەیێـکی هەڵـکێشاو گوتی : ئاخ تۆ نازانی زنجیـری ئاسن‌و کەلەپچـەو لێدان‌و پۆلیسی بەندیخانەو ئەشکنجەو لەسەر دارو بەرد نووستن‌و سەرماو گەرمـا ،

هەموویان هۆی ناڕەحەتین • تەنانەت سەگیش لەبەعزە کەمێك خۆش بەختترە •

نان حازر بوو ، قەشە زۆر بەڕوخۆشی پیاوە غەریبەکەی لەلای ڕاستیو خوشکەکەی لەلای چەپی دانیشتو دەستیان بەنان خواردن کرد •

## « بێ دەنگی »

لەدوا ئەوەی کە قەشە شەو باشی لەگەڵ خوشکەکەی کرد ، یەکێك لە شەمعدانە تەلاکانی بەدەستەوە گرتو یەکی تری دا بەمیوانەکەو گوتی : ئاغا وەرە با ژوری خەوتنت نیشان بدەم • کابرا هەستا وەدوای کەوت • خانوەکە وا دروست کرابوو لەژوری نوستنی قەشەوە دەچوو بۆ نوێژ گەکە • لەو کاتەدا کە ئەوان دەڕۆیشتن کارەکەرەکە زەرفە تەلاکانی دەخستەوە ناو گەنجینەوە • قەشە میوانەکەی بردە ژوری نوستنو میوان شەمعدانەکەی لەسەر مێزەکە دانا • قەشە گوتی : ئومێد ئەکەم شەو بەئاسودەیی بخەویو بەیانیش لەپێش ڕۆیشتن فنجانێك شیری گەرم بخۆوە جا بڕۆ •

ئێستا قەشە قسەکانی تەواو نەکردبوو کە میوان لەناکاو ڕوی کردە قەشەو بەتوڕەییەوە بەهەر دو دەستان کێشای بەسنگی قەشەداو بەتووندی گوتی : ئاخ ڕاستە تۆ ئەوەندەم لەخۆت نزیك دەکەیەوە ؟ هەر لەدوا ئەو قسە زۆر بەعەجایبی دەستی کرد بە پێکەنینو ووتی : تۆ چوزانی من پیاو کوژ نیم ؟

قەشە لەسەرخۆ گوتی : خوا هەموو شتێك دەزانێ ، چەند دوعـای بە سەر میواندا خویندو چۆ ژوری نوستنی‌خۆی • کابرا بە بای کوونە لووتانی شەمعەکانی کوژاندەوەو بەلیباسەوە چۆ ناو جێگاوەو خـەوی لێ کەوت • لەپاش ماوەیەك هەموانیان خەویان لێ‌کەوت‌و دنیـــا ئارام بوو • بێ‌دەنگی حوکماتی دەکرد •

# « ژان والژان »

ژان‌والژان لەنیوە شەودا وەخەبەر هات • ئەو لەخانەوادێکی هەژار لە دایك ببوو • بەمنداڵی نەی‌خۆیندبوو ، چونــکە هەر منداڵ‌بوو باوك‌و دایــکی مردبوون ، تەنیـــا خوشکێــکی بوو بەحەوت منداڵەوە ، (ژان‌والژان)ی بردە لای خۆی‌و ئاگاداری دەکرد • خوشکەکەشی منداڵی گەورەی تەمەنی هەشت‌ســـاڵ بوو کەمێردەکەی مرد • ( ژان‌والژان ) تەمەنی گەیە بیست‌و پێنج‌ساڵ‌و هەمووکارێکی دەکرد ، بەتایبەتی لە کاتی گوڵچنینەوەدا رۆژی هەشت (سوی)پەیدا دەکرد • زور بەباشی خەرجی خوشکەکەی‌و منداڵەکانی ئەداو چاو دێری دەکردن • خوشکەکەی لەبەر منداڵەکانی هیچی بۆنەدەکرا ، زۆر دەست‌کورت‌و هەژار بوو • ئـــەو ساڵە ساڵەکەی زۆر سەقەت بوو • (ژان‌والژان)یش بێ‌کار بوو • مـــاڵی خوشکی نانیان نەبوو ، شەوی یەك شەممە تازە نانەوای گەڕەکە کـەیان چاوی چوبۆ خەو گوێی لەشەقەی شوشەی موغازەکەی بوو شکاندیان ، گورج هەستا تەماشای‌کرد دەستێك لەکونی شوشەکەوە هـات‌و چـــەند نانێکی هەڵگرت‌و ڕۆیشت ، نانەوا وەدوای کەوت زۆری نەخایاند گرتی• دزەکە نانەکەی فڕێدا ، بەڵام دەستی بەشوشەی موغازەکە بریندار بوو ، هەر خۆینی‌لێ دەتـکا •

ئەو دزە (ژان‌واڵژان)بوو • ئـــەو کـــارەساتە لەساڵی ١٧٩٥ دا ڕوی‌دا • بردیان بۆ دادگاو بەپێنج‌ساڵ مەحکومیان‌کردو ناردیان بۆ شاری ( تولون )و لەپاش بیست‌و حەوت ڕۆژ گەیشتە بەندیخانەی ئەو شارە • لیباسی زیندانیان لەبەر کردو کەلەپچەیان کردو ناویان نا بەندی ژمـــارە (١٤٦٥١)و ناوی لەبیر خەڵك‌چۆوە ، بەڵام ئەو هەمیشە لەیادی خوشکە هەژارەکەی‌و حەوت منداڵەکەیدا بوو • نزیك ساڵی چواری بەندیخانە ، هاوڕێکانی یارمەتیان‌داو شەو لەزیندان ڕای‌کردو سیی‌و شەش سـەعات نە نانی بۆخـورا ، نە ئاوی خواردەوە • ئاخـری گرتیانەوەو ، دادگا سێی ساڵی‌تری حوکم‌داو حوکمەکەی بوو بە هەشت ساڵ • لەساڵی شەشەمدا دوبارە فیراری کردەوە ، بەڵام دوبارە پۆلیس گرتیانەوەو پێنج ســـاڵی تریان بەندی بۆ زیادکرد • دوساڵ بە زنجیری دولا دەیان بەســـتەوەو بەندی‌یەکەی بوو بـە سێزدە ساڵ • لەو ساڵەدا دوبارە لەزینـــــدان ڕای‌کردەوە • ئەو جـارەش گرتیانەوەو سێی ساڵی تریان بۆزیادکردو ماوەکـەی بوو بەشازدە ســـاڵ • لەساڵی سێزدەدا دوبارە ڕای‌کردەوە لەپاش چوار سەعات گرتیانەوە ، سێی ساڵی‌تریان حوکم‌داو بوو بە نۆزدە ســـاڵ • لەساڵی ١٧٩٦ دا بەهۆی نان‌دزینەوە گیراو لەساڵی ١٨١٥ دا ئازاد کرا •

## « غەمێکی تازە »

کـاتێك دەنـگی تۆ ئازادی لەبەندیخانەی هاتە بەرگوێ ، باوەڕی نەدەکرد • تروســـکەی نووری حـــەیات ، تروسکەی نوری ژیـانی مرۆڤایەتی لە نـــکاو ڕوحی ڕوناك کردەوە ، بەڵام زۆری نەخـــایاند خامۆش بۆوە • ئەو بە ئازادی بەپەرێشان‌و ناڕەحەت بوو ، خوی بەژیانی

بەندیخانەوە گرتبوو ، زۆری پێنەچو بۆی دەرکەوت کـــە ئازادی بۆ یەکێك کە پەساپورتەکەی زەرد بێ چ مەعنایەکی هەیە ؟

ڕۆژێك دوا ئازادی لەشـــاری (گواس) چۆ کارخانەی شەربەتی پرتە قاڵو دەستی کرد بەکارکردن ، زۆر بەتاقـــەتو ئازاو ڕەشید بوو ، خاوەن کارەکە وەبەر دڵی کەوت • بەڵام لەکاتێکدا خەریکی ئیش بوو ، پۆلیسێك هـات داوای وەرەقەی لێ کرد ، ئەویش وەرەقە زەردەکـەی نیشانداو ناچار بوو دەست لەکار هەڵگری • شەو چوو بۆلای خاوەن کار ڕۆژانەکەی وەرگرێ ، پازدە (سوی) دایەو گوتی : بڕۆ کارێـکی تر بۆ خۆت بدۆزەوە • بەوجـۆرە بوو کەشـــاری (گواس)ی بەجێ هێشتو لەشاری (دینی) تووشی بوین •

## « مرۆڤێك وەخەبەر دێ »

هەر کەزەنـگی کلیسا سەعات دوی دوا نیوەشەوی ئیعلام کـــرد (ژانوالژان) وەخەبەر هات • ئەوەی کەبوو بەهۆی وەخەبەر هـــاتنی ڕاحەتی ناو لێفەو دۆشەکەکە بوو ، چونکە نزیکەی بیست ساڵ بوو لـە لێفەو دۆشەکدا نەنوستبوو • هەرچەند بەلیباسیشەوە نوستبوو ، بـەڵام خەوی هەرخۆش بوو • کەوە خەبەر هات دەستی کرد بەبیرکردنەوە ، بەتایبەتی زۆر بیری لەو شەش قاپە زێڕە و شەمعدانە دەکردەوە کە چاوی لێ بوو کارەکەرەکە لەکوێ دای نان •

سەعاتێکی تەواو لەبەحری خەیاڵدا مەلەی کرد • زەنـــگی کلیسا سەعات سێی لێدا ، چاوی گوشینو دەستی بۆ کۆڵە پشتەکـەی بردوو قاچی لە سەر قەرەوێڵەکە بەردانەوەو دانیشت • دوبارە خەیاڵی چـۆوە

سەر قاپە زێڕەکان ، ئەگەر زەنگی سەعاتەکە سێی و نیوی لێنەدایە ، تا بەیانی هەر بەو خەیاڵەوە دادەنیشت ، بەڵام سەعاتەکە وەك پێی بڵێ : زوکە ، خێرابە ! لە جێی خۆی هەستاو گوێی هەڵخست ، بێدەنگی حاکم بوو لەماڵەکەدا ، بەسپاوی چوو بۆلای پەنجەرەکە دنیا زۆر تاریك نەبوو ، مانگ بەئاسمانەوە دیاربوو ، هەور بەهۆی باوە بەپێش ناوچاوانی مانگدا تێدەپەڕین و سێبەرو ڕوناکیان لەزەوی دەکرد • ئەو ڕوناکیە بو بەهۆی ئەوە ڕێگا بدۆزێتەوە • چوو پەنجەرەکەی تاقی کردەوە ، دانەخرابوو ، بۆ ناو باغەکە دەکرایەوە ، بەڵام پای دەهات زوپێیەوە دایەوە •

چوو بەلای دۆڵابەکەوە ، کۆڵە پشتەکەی هێناو شتێکی لەدۆڵابەکە دەرهێناو خستیە ناوی و لەسەر قەرەویلەکەی دانا ، لەپاشان کەوشەکانی لە باخەڵ ناو کۆڵەپشتەکەی بەشانداداو کڵاوەکەی لە سەر ناو،عەصاکەی و میلێکی ئاسنی بەدەستەوە گرت و هەناسەی لەخۆی بڕی و بەرەو ژوری قەشە کەوتەڕێ ، کە تەماشای کرد ژوری قەشەدانە خرابوو ، هەرپێوە درابوو •

گوێی هەڵخست هەناسەی کەس نەدەهات ، دەرگاکەی کردەوە وەکو پشیلەیەك کەبەبێ هەست دەرگایەك دەکاتەوە ، دەرگاکە کرایەوە • دوبارە دەستێکی بەدەرگاکەوە نا بۆ ئەوەی زیاتر بکرێتەوە ، بەڵام ئاڵقەڕێزی دەرگاکە زرینگەیەکی وای لێ هات ، تەواوی ژورەکان دەنگیان دایەوە • ژان والژان ئەوەندە ترسا دەتگوت : نەفخی سوری ڕۆژی قیامەتی لەبن گوێ لێدرا •

چەند دەقیقە وەك بەردێکی بێدەنگ لەجێی خۆی ڕەق بوو ، لەپاشان گوێی هەڵخست کەس وەخەبەر نەهاتبوو ، ئاسمان ماوەی

نیو سەعات لە ژێر هەوری ڕەشدابوو • لەنکاوێك هەورەکان وەك بەدەست لایان بەی مانگیان بەرداو تیشـــکی لەپەنجەرەکەوە ژورەکەی ڕوناك کردەوەو (ژانواژان) چاوی بەجەستەی قەشە کەوت لەسەر تەختەکەی بە ئارامی نووستبوو ، ناوچاوانی زۆر نوورانیو لەخەودا زەردە خەندەی لەسەر لێوان بوو ، لەتەمەنی خوێـــدا چاوی بەپیاوی وا نەکـــەوتبوو • خۆفێـــکی زۆری ڕێ نیشت • چـــاوی لەجەستەی قەشەوە بڕی‌بوو نەیدەگواستەوە • لەپاش بەینێك لەنـــکاو بەلای قەشەدا ڕۆیشتو چـــۆ لای گەنجینـــەکە ، تەماشای‌کرد دانەخرابوو ، دەرگای گەنجینەکەی کردەوەو هەرزێرێکی تێدابوو هەڵی‌گرتو خستیە ناو کۆڵەپشتەکـــەی‌و سەبەتەی ئاڵتونەکەی برد فڕێی دایە ناو باغەکەوەو لەپەنجەرەوە خـــۆی فڕێیدایە ناو باغەکەوەو وەك پڵینك بۆی‌دەرچوو • کاتێك ڕۆژ هـــەلاتو هەتاو کەوت ، قەشە چۆ ناوباغەکەو دەستی کرد بەپیاسە • لەنکاو خزمەت کارەکەیان هات هـــاواری کـــرد : قوربان دەزانی سەبەتەی زێرە کـــان لەکوێیە ؟ خۆ لەجێی خۆی نەماوە •

قەشە گوتی : بەڵێ ! ــ گۆتی : سپاس بۆ خوا من نەمدەزانی چـــی لێ‌هاتووە • قەشە ئەوکاتە سەبەتەکەی بەخاڵی لەناو باغەکـــەدا چـــاو پێ‌کەتبوو ، هەڵی‌گرتو گوتی : بیگرە ئەوەتا ، بەلاّم هیچی‌تێدا نیە •

کارەکەرەکەیان ڕای‌کردەوە ژورو بەهاوار کردن هاتەوە گوتی : کابرا لەجێگاکەیدا نەماوە ، ئەو بردونی •

قەشە تۆزێك بێ‌دەنگ‌بوو لەپاشان‌گوتی : زۆر لەمێژبوو بە ســەهو ئەو زێڕانەم ڕاگرتبون ، ئەو زێڕانە ماڵی هەژاران بوون ، میوانەکەشمان یەکێك بوو لەهەژاران • قەشە پەرۆشی ئەوگولاّنەی بوو کـــە بەهۆی سەبەتەکەوە شکابوونەوە ، ڕاستی دەکردنەوە • قەشە بۆ بەرچایی خواردن

زۆر بە ڕوخۆشی چوو لەسەر ئەومێزە دانیشت کە شەو لەگەڵ میوانەدزەکەی نانیان لەسەر خواردبوو لە چاپی خواردن بوونەوەو یەکێك لەدەرگای‌دا ، ـ گوتی :

فەرموو : دەرگا کرایەوە ، سێی کەس دیاربوو پۆلیس بوون ، یەکێکیان گرتبوو وەژوور کەوتن • گەورەی پۆلیسەکان چۆ پێشەوە سەلامی کردو قەشە وەلامی دایەوە ، کەزانی گرتووەکە (ژانواڵژان)ە گوتی : ئەی ئەوە تۆی ؟ بە چاوپێکەوتنت زۆرپێ خۆشحاڵ بووم ، ئەی ئەوە بۆ شەمعدانەکانت نەبردبوو ؟ خۆ ئەویشم بۆتۆ دانابوون • (ژانواڵژان) زۆر سەیری لەقەشە دەڕوانی • گەورەی پۆلیسەکان ووتی: قوربان کەواتە ئەو پیاوە ڕاستی دەکرد کە دەیگوت : ئەو ئاڵتونانە قەشە داونی بەمن ؟ ئەگەر وابێ ئازادی دەکەین • قەشە گوتی : بەڵێ : پۆلیسەکان خواحافیزیان‌کردو ڕۆیشتن • قەشە شەمعدانەکانی هەڵگرتو دانی بە (ژانواڵژان) • ژانواڵژان لەخەجاڵەتیان وەك مێرۆکی دەلەرزی •

قەشە گوتی : بڕۆ خوا ئاگادارت بێ ، ماڵی خۆتە ، هەر کاتێ بێیتەوە دەرگا لەسەرپشتە ، تۆ تازە برای‌منی •

## «پنی ژروە »

ژانواڵژان بەخەجاڵەتیەوە وەدەر کەوت لەو کوچە بۆ ئەو کوچەو لەو گەڕەکە بۆ ئەو گەڕەکەو،لەو شەقامە بۆ ئەوشەقامە دەپەڕیەوە،نەیدەزانی بۆکوێ دەچێ • ئەو ڕۆژە تائێوارە بەو حاڵە سەرگەردان بوو ، هیچی نەخواردبوو هەستێشی بەبرسی‌یەتی نەدەکرد • خەیاڵێکی تازەی هاتبۆ مێشکەوە • کاتێك ڕۆژ هاتبۆ ئاوابوون گەیشتەلای بیشەلانێك ، لەوانسە

بوو چەند فرسەخ لە شاری (دینی)دور بێ • لە نکاوێك گوێی لەدەنگی یەکێك بوو ، کە ڕوانی منداڵێك بوو یاری بەپارە دەکرد ، چەند دراوێکی پێ بوو هەڵی داویشتن و دەی گرتنەوە • لە هەڵاویشتنەکەدا دراوێك پەڕی ، بە تاز تازیلە هاتە بەر پێی (ژان والژان و) گورج پێی لەسەر داناو لەسەری ڕاوەستا • منداڵەکە بێ ترس هات گوتی : ئاغا کوا پارەکەم ؟ ژان والژان لێی پرسی ناوت چیە ؟ گوتی : ناوم (پتی ژروە) یە • ژان والژان بەتوڕییەوە ووتی : بڕۆ • کوڕەکە هەر دەیگوت : پارەکەم ـ پارەکەم ، ئەویش سەری بەردابۆوە دەنگی نەدەکرد و چاوی دە عارزێوە بڕی بوو •

منداڵەکە کۆتەکەی گرت و ڕای وەشاند و داهاتەوە بۆ قاچی کە لەسەر پارەی منداڵەکەی دانابوو بەرزی کاتەوە و دەستی کرد بەگریان • ژان والژان بەتوڕییەوە دەستی بۆ عەصاکەی بردو گوتی : کوڕە کوڕی کێی ؟ کوڕە بەگریانەوە ووتی : (پتی ژروە)م قاچت بەرزکەوە پارەکەم هەڵگرمەوە • ژان والژان توڕە بوو گوتی : ئای ئەوە تۆیی ؟ داڕاوەستە ، کوڕەکە لەترسان دەستی کرد بە لەرزین و ڕای کرد •

ڕۆژ ئاوابوو ، ژان والژان هەر لەجێگای خۆی ڕاوەستابوو ، لەنکاوێك موچڕکێکی ساردی بەلەشیدا هات ، سەرمای بوو ، دوگمەی کۆتەکەی داخستن و داهاتەوە عەصاکەی هەڵگری ، چاوی بەپارەی کوڕەکە کەوت کەنیوەی بەهۆی قورسایی قاچی چوبوو دەقوڕەوە ، وەکو هەورە تریشقەیەك لێیدا ئاوا ناڕەحەت بوو ، گوتی : دیسان ئەوە چیە ؟

لەپاشان پارەکەی هەڵگرتەوە و تەماشایێکی دەورو بەری کرد کەسی نەدی •

هەور ئەوەندەی تریشیان شەو تاریك کردبوو ، وەڵات ساردو

ڕوت بوو ، هەناسێکی هەڵکێشاو ڕوی کردە ئەولایە کە کوڕەکەی پێـــدا ڕووی بوو • قەشەیەك بەسواری بەوێدا هات ، (ژانواڵژان) چـــۆ بەر دەمی‌و گوتی : ئاغا منداڵێکت نەدی بێرەدا ڕۆیی ؟ ووتی : نەخـــەیر • ژانواڵژان دو پێنج (فرانکی) دەرهێناو دای بە قەشە ووتی : قوربان ئـەو پارە بـگرە ، ئەوە ماڵی هـــەژارانە • دوبارە زۆر بەعـەجولانە پێنج (فرانکی)تری دایەو گوتی : ئەوەش بۆ فەقیرانو لەپاشان گوتی : جەنابی قەشە من دزم ، وابـکە بمـگرن • قەشە گوێی نەدایە پێی بەئەسپەکەیەوە ناو بۆی دەرچوو • ئەویش هـــەر ڕۆیی هـــەر ڕۆیی تا گەیشتە سێی ڕێیانێك زۆر ماندوو هیلاكبوو ، چوو لەسەر بەردێکی گەورە دانیشت‌و گوتی : ئای چەند بەدبەختم ! دەستی کرد بەگریان ئەوە یەکەم جـار بوو کـە لەپاش نۆزدە ساڵ بـگری • لەکاتی گریانەکەدا نورێك هـــاتە خەیاڵیەوە ، نورێـکی‌وا تا دەهـات ڕوناك‌تر دەبوو ، زیاتر پەرەی دەستاند، نورێـکی عەجایب‌بوو ، ژیانی ڕابردووی ، خـەراپەی یەکەمی ، ڕەنجی دەرونی ، ئازاد بوونی لەبەندیخانە ، ئەوەی لە ماڵی قەشە بەسەری هات ، دزی پارەی کوڕەکە ، هەمووی هاتنەوە خەیاڵ • بەلام دڵی وا ڕوناك ببۆوە کەوای دەزانی لەنووری بەهەشتدا تەماشا شەیتان دەکا •

چەند ئاوا گریاو ؟ لەپاش گریانەکەی چی‌کردو ؟ چۆ کوێ ؟ کەس نەیزانی •

## « چاو پێك کەوتنی دو دایك »

لە ئەووەڵی ئەم چەرخەدا لەشاری (مونت‌فرمیل)ی نزیك شـــاری (پاریس) لە گەڕەکی (بۆلانژر) قاوەخانەیەك بوو ، ئێستا نەماوە ، ئی ژن‌و پیاوێك بوو بەناوی عائیلەی (تناردیە) • لەسەر دەرگاکەی وێنەی مرۆڤێك

کێشرابوو مرۆڤێکی لەکۆڵ بوو ، دەرەجەی ئەفسەری لەسەر شان بوو ، **باقی تابلۆکە** بەشکڵی دوکەڵو ئاگر پڕ کرابۆوە ، وەك وێنـــەی شـــەڕ دەچوو • دەورو بەری هەموو داری گەورە بوو ، زنجیرێك لە دارێکیان قایم کرابوو ناوەڕاستەکەی شۆڕ ببۆوە • دو کچ کە گەورەکەیان تەمەنی دو ساڵو نیو بوو ، ئەوی تریشیان هەژدە مانگ بوو لە ناو ئەو جۆلانـــەدا بوون کـــە بەناوەڕاستی زنجیرەکەوە بوو • دایکەکەیان لەسەر ســـەکۆی قاوەخانەکـــە دانیشتبوو ، پەتێکی درێژی لە جۆلانەکەی خستبو لەوێڕا ڕای دەژاند • کچەکــــان لەخۆشیان هەر هاواریان بوو ، لەم لاشـــەوە ئافرەتێك منداڵێکی بەباوەشەوە بوو ، کۆڵێـــکیشی شت لـــە کۆڵ بوو ، منداڵەکەی ئەوەندە جوان بوو دڵت نەدەهات تەماشای کەی • پارچێـــکی حەریری پێدا دابوو ، ڕیشوەکانی بەسەر شانانیدا پەخشان ببوون ، وەك پەلـکی گوڵ ناسك بوو • کەچاوت پێدەکەوت خەریك دەبووی گازێك لەسەر کوڵمە سورەکانی بگری • بەوحاڵەوە خەوی لێ کەوتبوو •

ئەودو ئافرەتە دەستیان کرد بەقسانو دایـکی دو کچەکە ووتی : من ناوم خانمی (تناردیە)یەو ئەو قاوەخانە بەدەست ئێمەوەیە •

ئەوی تریان گوتی : منیش ژنی کرێـکارێك بووم ، مێردەکەم مردو هاتم بۆ شاری (پاریس) کــــارم دەست نەکەوت ، ئێستا بەدوا کــــاردا دەگەڕێم : تا نزیك شاری (ویلومبل) بەسواری عەرەبانە هاتمو لەوێوە بەپێیان هاتوومە ئێرە • لەدوا ئەوقسانە تووند ڕومەتی کچەکەی ماچ کردو وەخەبەری هێنا • کچەکە بەدەورو پشتی خوێدا ڕوانی چـــاوی بەدو کچەکە کەوت دەستی کرد بەپێکەنینو چوو بۆلایان • دایـــکی دوو کچەکـــە گوتی : کچەکـــەت ناوی چیە ؟ لەوەڵامدا ووتی : ناوی (کەزیە)یە • گوتی : تەمەنی چـــەندە ؟ ووتی : تازە پێی ناوەتە سێی

ساڵ • گوتی : وەك کچەکەووەکەی من وایە ••

منداڵەکان پێکەوە یاریان دەکرد ، دایکی دو کچە گوتی : تەماشا چەند زوو خویان پێکەوە گرت • ئەوەی چاوی پێ بکەون وەدەزانێ هەر سێکیان خوشکن •

دایکی کچەکە زۆری پێخۆش‌بوو ، دەستی دایکی دوکچەکەی گرتو گوتی : ئەرێ ئەو کچەم بۆ بەخێو ناکەی ؟ چونکە ناتوانم بەو کچەوە درێژە بەسەفەرەکەم بدەم ، ئێستاش ناهێڵن منداڵ بەرنە سەر کار ، ئەوە خواکردی هاتم بۆێرە • دایکی دو کچەکە لەوەڵامدا گوتی : دەبێ بیری لێ بکەمە جا بڕیاری لەسەر بدەم • دایکی (کەزیە) گوتی : مانگی شەش (فڕانك) ئەدەم بۆم بەخێو کەی • لەنکاو پیاوێك لەژورەوە بە دەنگی‌بەرز گوتی : دەبێ حەوت (فڕانك) بدەی‌و پارەی شەش مانگیش لەپێشەوە بدەی •

دایکی (کەزیە) گوتی : زۆر باشە ! دایکی (کەزیە) چووە شاری (سورمر)و دەستی کرد بەکار کردن ، هەموو مانگێك یان خۆی دەچوو ، یان نامەیەکی بۆ دەناردن • ئەوانیش لەوڵامیدا دەیانگوت : (کەزیە) زۆر باشە ، بەڵام ئەمان زۆر نانەجیب بوون ، کاتێ پارەکەیان برا ، دایکی دووکچەکە جل‌و لیباسی (کەزیە)ی بردە شاری (پاریس)و دای بە شەصت (فڕانك)و خەرجی‌کرد • لیباسە کۆنی کچەکانی خۆی لەبەر دەکردو ، بەرماوی منداڵەکانی بۆ تێدەکرد بیخوا • بەکورتی وەکو سەگ‌و پیشلە نان‌و ئاویان دەدایە •

لەپاش شەش مانگ نامەیەکیان بۆ دایکی ناردو داوای مانگی دوازدە (فڕانك)یان لێی کرد ، ئەویش لای وابوو زۆر باش خزمەتی

کچەکەی دەکەن ، ڕازی بوو • بەڵام بەپێچەوانەی بیرو ڕای ئەم ، ئەوان زۆری لەگەڵ خەراپ بوون ، دو منداڵەکانیش چاویان لە دایکیان دەکرد ، چونکە منداڵ لەو تەمەنەدا نوسخە بەدڵی دایکیەتی‌و چاو لەو دەکا •

خەڵك دەیگوت : تەماشا ماڵی (تاردیە) چەند باشن ؟ بەو فەقیریە خزمەتی منداڵی خەڵك دەکەن ، لایان وابوو دایکی (کەزیە) (کەزیە)ی لەبیر چۆتەوە • لەپاش بەینێك نامەیەکی تریان بۆ نووسی‌و نووسیان کچەکە گەورە بووەو خواردن‌و لیباسی زیاتر دەوێ ، دەبێ مانگی پازدە (فرانك)مان بۆ بنێری ، ئەگینا دەری دەکەین : دو بارە ڕازی بوو بەڵام ئەو بەستەزمانە تا گەورەتر دەبوو دەکەوتە ژیانی ناخۆشترەوە • بە منداڵی بەهەموان لێیان‌دەدا ، کە گەورەش بوو کردیان بەکارەکەرو، هەموو بەیانیان بەسەرمای زستان بەردەگایان پێ دەماڵی •

## « پێشکەوتن »

دایکی خەڵکی شاری (مونت‌مرمیل)بوو ، خەڵك لای وابوو ئەو دایکە بەستەزمانە کچەکەی بەرهەڵدا کردووە • دایکی ( کەزیە ) دوازدە ساڵ بوو نەچوو بۆوە شارەکەی خۆی ، کاتێ لە ساڵی (١٨١٨)ی زاینیدا ڕوی کردەوە شاری (سورمر)ی جێگای لەدایك‌بوونی ، شار بەتەواوی گۆڕابوو ، زۆری فەرق کردبوو ، لەماوەی دو ساڵدا لەیەکێك لە پیشە سازیەکانیدا کە لەلایەن کۆمەڵی دەست‌کورتەوە زۆر گرنگە پێشکەوتنێکی زۆر گەورە ڕوی دابوو •

زۆر لەمێژ بوو خەڵکی شاری ( سورمر ) لەدروست کردنی

جەواهیرات‌و بلوریاتدا چاویان لەئینگلیسەکان‌و ، لەشوشە جاتیشـــدا وەدوا ئەڵمانیەکان دەکەوتن • لەئاخری ساڵی (١٨١٥)دا پیاوێکی غەریبە **هاتبوو ، کارخانێـکی ئالقەو بازنەو** زنجیری هێنابوو ، زۆر بەهـەرزانی دروستی دەکردن • لەماوەی سێی ساڵدا زۆر دەوڵەمەند ببوو ، بـە دەست مایەیێکی کەمـــەوە هاتبوو ، بەڵام بەهۆی لێ هاتوییەوە زۆر سوودی بە خۆی‌و خەڵك گەیاند بوو •

یەکەم جار کەهاتبوو بەلیباسی کۆنەوە وەك کرێکارێکی ســـادە دەچوو ، لەیەکێك لەشەوەکانی ئەووەڵی مانگی کانوونی‌یەکەمدا بەخۆی‌و عەصایەکەو کۆڵەپشتێکەوە هاتە شاری (سورمر) • لەوکاتەدا ئاگو لـــە ماڵێك بەربوو ، چوبوو خۆی خستبۆ هیلاکەتەوەو منداڵەکـانی رزگـار کردبوو • دو منداڵەکـــە دو کوڕی ڕەئیسی شارەوانی بوون • لەبەر خۆشی‌و شادی کەس وەسەر نەپرژا داوای پەساپۆرتی لێ بکا • زۆریان رێز لێ گرت‌و ناویان نا باوکە (مادلن) •

باوکە (مادلن) تەمەنی لەدەورو بەری پەنجادا بوو ، زۆر ڕوخۆش‌و دڵ پاك‌بوو ، هەموو کەسی بوکار کردن ڕا دەگرت ، تەنیا شەرتی ئـەوە بوو دەیگوت : مرۆڤێکی ڕاست‌بە ، یان بەئافرەتێکی دەگوت : ئافرەتێکی ڕاست‌بە • هەمیشە لەبیری خەڵـکدا بوو •

لە ساڵی (١٨٢٠)دا ، بو بەقاو کە ئەوەندە دەوڵەمەند بووە ، شەش سەت‌و سیی هەزار (فرانك)ی لەبانق‌دا داناوە •

بەڵام زیاتر لەیەك ملۆینیشی بۆ فەقیرو هەژاران خەرج‌کردووە • لە ئەووەڵەوە هەر یەکە بەجۆرێ باسیان دەکرد ، زور بەی دەی گوت : سەودای دەوڵەمەندی لەسەردایە ، بەڵام کەزانیان بەزۆری خەریـــکی

ئاوەدان کردنەوەی شارەکەیە دەیانگوت : نەخەیر : دیارە پیاوێکی خۆ بەزلزان‌و بەرزە فڕە •

بەڵام لەڕاستیدا پیاوێکی ئایینی‌بوو ، هەموو ڕۆژانی یەکشەممە بۆ دوعا دەچۆ کلیسا • لە ١٨١٩ دا دەنگ بڵاو بۆوە گوتیان : بەهۆی ئەو خزمەتە کۆمەڵایەتیانەو وەتەن دۆستیانەیەوە پاشا کردویەتی **بەسەرۆکی** شارەوانی شارو لەپاش چەند رۆژ ئەو هەواڵە لە رۆژنامەکاندا بڵاو کرایەوە ، بەڵام قبوڵی نەکرد •

هەر لەو ساڵەدا خەڵاتی یەکەمی نمایشگای پیشە سازی لەلایەن شاوە بۆ هات ، ئەویشی وەر نەگرت :

زۆری یارمەتی هەزاران دەداو خەڵك زۆریان خۆش‌دەویست • بەتایبەتی کرێکارەکانی شەریکەکەی هەر دەیان پەرست • لای خەڵك لە باوکە (مادلن)ی‌یەوە بوو بە جەنابی (مادلن)و کە تووشی دەبوون سەری بچووکیان بۆ دا دەنەواند • تا دەولەمەندتر دەبوو لای خەڵك خۆشەویستر دەبوو • خوا خوایان بوو بچێتە ماڵیان • لەماوەی پێنج ساڵدا ئەوەندەی خزمەتی شارو خەڵکەکە کرد ، داوایان لێ‌کرد ببێتە سەرۆکی شارەوانی ، بەتایبەتی قسەی پیرێژنێکی هەژار زۆری کار تێ‌کرد کەبەسەریدا نەڕاندو گوتی : سەرۆکایەتی شارەوانی کارێکی زۆر پیرۆزە ، تۆ کاری پیرۆز ناکەی ؟

باوکە (مادلن) بەقسەی کردو بوو بەئاغای سەرۆکی شارەوانی‌و زۆر بە باشی وەزیفەی خۆی بەڕێوە دەبرد • بەڵام بەزۆری بەتەنیا دەژیا ، لەگەڵ کەم کەس گفت‌و گوێ دەکرد • بانگ هێشتنی زۆر پێ نا خۆش‌بوو ، زۆر بێ‌دەنگ بوو ، ژنان ناویان نابوو بەرازی چاك ، بۆ

بیاسە بەزۆری دەچۆ ناو شیناورد ، موتالآی کتیبی زۆر دەکرد ، لەسەر نانخواردنیش کتیبی لەبەر دەم بوو •

هەر چەند گەنج نەبوو ، بەلام زۆر بەتاقەت بوو ، یارمەتی داماوانی زۆر دەدا ، ئەسپی عەرابانەچیانی لەقوڕ رزگار دەکرد • کە دەچوو بازاڕ گیرفانی پڕ دەکرد نەپارە ، بەلام بەگیرفانی خاڵیەوە دەگەڕایەوە • چۆن خەڵك خەراپە بەدزیەوە دەکەن ئەو ئاوای چاکە بەدزیەوە دەکرد • شەوانە دەچوو ماڵیفەقیرانو دەرگای دەکردەوەو پارەی بۆ لەسەر مێزو قادرمەو دالآندا دەنان • کاتێك پێیان دەزانی لایان وابوو دزە ، بەلام کەچاویان بەپارەکە دەکەوت واقیان وڕ دەما • ئەو پێی خۆش بوو بەئاشکرا یارمەتی بەعزە کەسێك نەدا ، بۆ ئەوەی خەجالەت نەبێ • خەڵك دەیگوت : پیاوێکی دەوڵەمەند لەشار دایەو بەدزی یارمەتی خەڵكئەدا • هەریەکە قسەیەکی لێ دەکرد • هێندێك دەیان گوت : عەنتیکە فرۆشە ، تا ئێستا کەس نەچۆتە ماڵەکەی •

جارێك کۆمەڵێك ئافرەت دەچن دەڵێن : هاتوین ماڵەکەتمان پێشان بدەی ! زەردە خەندەیەك دەکاو دەڵێ : فەرموون : کە دەچن تەماشا دەکەن زورێکی ناخۆش ، کاغەزی ڕەنگاو ڕەنگی لەدیوارەکان درابوو ، دو شەمعدان نەبێ هیچی لێ نەبوو ، وەك گۆڕ وا بوو ، بە پەلە هاتنەوە دەرەوە • واش خەڵك دەیگوت : ئەوەندە دەوڵەمەندە ؟ دەتوانێ بەچەکێك دو سێی ملۆین (فرانك) لە بانکی (لافیت) ڕاکێشێ •

## « تازیە باری »

لەئەووەلی ساڵی ١٨٢١ دا لەڕۆژنامەکاندا بلآو کرایەوە کە قەشەی نـاری (دینی) لـەتەمەنی هەشتاو دو ساڵیدا عومری درێژی دا

بەحازریان • رۆژی دوایی سەرۆکی شارەوانی لیباسی تازیە باری پۆشی، خەڵك لایان وابوو خزمی قەشەیە بۆیە تازیەی بۆ داگرتووە • تەنانەت ئافرەتێك چوو بەتایبەتی لێی پرسی ووتی : جەنابت خزمی قەشەی ؟ ـ ووتی : نەء • گوتی : ـ ئەی بۆلیباسی تازیەت بۆ پۆشیوە ؟ لەوەڵامدا گوتی : ئاخر چەند ساڵ خزمەت کاریان بووم •

## « نورێك لە هەڵاتندا »

رۆژ لەدوا رۆژ لای خەڵك خۆشەویستر دەبوو ، تا وای لێهات کە چۆن لەدەورو بەری ساڵی ١٨١٥ دا خەڵك بۆ هەموو کارو فەرمانێك دەچوو نەلای قەشەی شاری (دینی) لە ساڵی ١٨٢١ یەکیشدا خەڵك لەدەیان فرسەخەوە دەهات بۆلای ئەمو کرێ کوێرەی دڵی خۆیان لا دەکردەوەو بەقەزاوەتی ڕازی بوون • وایان دەزانی تەواوی یاسای لەبەرە • زۆر جار کەبەخیاباندا دەڕۆیی چەند کەس لە لایەنگرەکانی لەپاشیەوە بە ئەدەب دە رۆیشتن •

بەڵام زۆر جار پیاوێکی باڵابەرز کڵاوێکی پانی لەسەربوو ، کۆتێکی خۆڵەمێشی لەبەردا بوو ، لەسوچێکەوە پەیدا دەبوو ، زۆری تەماشا دەکردو سەری ڕادەوەشاندو لەبەرخۆیەوە دەیگوت : ئەوە کێیە ؟ من جارێکی تریش دیومە •

ئەو پیاوە ناوی (ژاور)و پولیسی نهێنی ئەمن بوو • ئەو کاتە کە باوکە (مادلن) هاتبۆ شار ، ئەم لەوێ نەبوو • (ژاور) هەمیشە وەدوا باوکە (مادلن) دەکەوت و زۆر سەیری سەرنج دەدایە ، باوکە ( مادلن ) زانی بووی ، بەڵام موبالاتی پێ نەدەکردو وەك خەڵکی تری تەماشا

دەکرد • (ژاور) زۆری پێ ناخۆش‌بوو • ڕۆژێك بەکردەوەیەك باوکە (مادلن)ی زۆر ناڕەحەت کرد ، کەبەوجۆرە بوو •

## « بابا فوشلونت »

ئاغای (مادلن) بەیانی ڕۆژێك لەیەکێك لەگەڕەکەکانی شـــاردا دەگەڕا ، لەنـــکاو گوێی لەدەنگێك بوو هاواری دەکردو کۆمەڵێك خەڵك دیار بوو • چوو بەلایانەوە ، تەماشـــای کرد پیرە مـــەردێك بەناوی بابا (فوشلونت) ئەسپەکەی کەوتۆتە ژێر عەرەبانەکەیەوە •

بابا (فوشلونت) (مادلن)ی زۆر ناخۆش دەویست ، چونکە بەهۆی کارخانەکەی ئەوەوە ، کـــاری ئەو جۆرە کەسانە کەم ببۆوە • لەمـــاڵی دنیا تەنیا ئەسپ‌و عەرەبانەیەکی هەبوو پێی‌بژی ، نە دەرفەتێك دەگەڕا کە کوڵی دڵی خۆی بە ئاغای (مادلن) بڕێژی •

(مادلن) تەماشای کرد هەر دو پێی ئەسپەکەی شکابوو ، ئەسپەکـــەی دەتوانی لەجێی خۆی تەکان بخواو عەرەبانە چیش لەبنیدا **کەوتووە‌و** گرانی ئەسپەکەو گرانی بارەقورسەکەی لەسەر سینگە • هاوار دەکـــاو دەڵێ : فریام‌کەون • خەڵك دەوورەیان گرتووە ناتوانن رزگاری بکەن ، چونـــکە دەبوو عەرەبانەکەی لەسەر سینگ لابەن • خۆ ئەگەر تۆزێکیان بیزاوتایە دەبوو بەهۆی لەبەین بردنی • (ژاور) پۆلیسی نەهێنی ئەمنیش زو چوو بوو ناردبووی نوێڵێك بێنن عەرەبانەکـــەی پێ بەرزکەنەوە • خەڵك کەچاوی بە(مادلن)کەوت زۆریان ڕێز لێ‌گرت • ڕووی کـــردە خەڵکەکەو گوتی : ئەوە نوێڵێك نیە پیی بەرز کەینەوە ؟ یەکێك گوتی : چوون پەیدای کەن ، بەڵام بە چارەگە سەعاتێك دێنەوە •

شەوی پێشوو باران باری بوو ، تا دەهات عەرەبانە زیاتر بەقوڕدا دەچوو خوارەوەو گرانایی دەخستە سەر سینگی کابرا پیرەو تا پێنج دەقیقەی‌تر بەتەواوی ڕۆ دەچوو • باوکە (مادلن) گوتی : چار چیە ؟ چۆ پێشەوە تەماشای کردو گوتی : خەڵکینە ئەرێ لەبن عەرەبانەکەدا جێی نەفەرێك دەبێتەوە کە بچێ شانی وەبەرداو ڕاستی بکاتەوەو رزگاری بکەین ؟ هەر کەسێك ئەوە بکا خەڵاتی دەکەم • هەموان سەریان بەردایەوە دەنگیان نەکرد ، یەکێك نەبێ لەبەرخۆیەوە گوتی : کەس دەستی لەگیانی خۆی هەڵ نەگرتووە ؟

ئاغای (مادلن) ڕووی وەرگێراو چاوی بە (ژاور) کەوت کە تا ئەو کاتە نەی‌دی‌بوو • (ژاور) دوبارە گوتی : ئەوەی بتوانێ ئەوکارە بکا دەبێ زۆر بەتاقەت‌بێ • گوتی : ئاغای (مادلن) من لەدنیادا یەکێك دەناسم کەهەر ئەو دەتوانێ ئەو کارە بکا • کەئەویش زیندانی بوو • ( مادلن ) بەوقسەی (ژاور) ڕەنگی سپی بوو •

لەو کاتەدا پیرە هاواری کرد گوتی : فریام کەون سینگم شکا ! ئاغای (مادلن) سەری بەرزکردەوەو تەماشایەکی (ژاور)ی کردو لەخەڵکەکەی ڕوانی‌و بەچوکدا هات‌و چوو دەبن عەرەبانەکەوەو تینی دایە خۆی‌و تا نیوەی تایەی عەرەبانەکەی بەرزکردەوەو لەقوڕ هاتە دەر ، هاواری‌کرد ـ خەڵکینە یارمەتیم بدەن • خەڵکەکە غیرەتیان بزوت‌و پەلاماریاندا ، عەرەبانەیان بەرزکردەوەو عەرەبانەچیان لەبن هێنایە دەر •

## « فوشلونت دەبێتە باغەوان »

لە کەوتنەکەیدا سەر ئەژنۆی دەشکێ‌و ( مادلن ) دەی‌باتە نەخۆشخانەی کارخانەکەی • ڕۆژی دوایی تەماشا دەکا وەرەقەیەکی

هەزار فرانکی لەسەر جێگایەکەیەتی‌و نامەیەکیشی لەگەڵە بەدەست خەتی (مادلن) نووسرا بوو ، نووسی بووی من ئەسپ‌و عەرەبانەکەتم کڕیوە • ـ عەرەبانەکە شکابوو ، ئەسپەکەش تۆبی‌بوو • (فوشلونت) چاك‌بووە ، بەلاَم تۆزێك دەشەلی •

ئاغا (مادلن) هەوڵی بۆدا لە کلیسای پاریس‌دا کردی بەباغەوان•زۆر لە مێژ نەبوو (مادلن)ببوو بەسەرۆکی شارەوانی کە ئەو کارەساتە ڕوویدا • یەکەم جار کە (ژاور) (مادلن)ی لەبەرگی سەرۆکی شارەوانیدا دی تەزوێکی پیداهات ، وەك سەگێك گورگێك لەلیباسی خاوەنەکەیدا ببینی • لەو ڕۆژە بەدواوە زۆر دوری لە (مادلن) دەکرد • کاتێ ناچاریش دەبوو بەهۆی شوغڵەکەیەوە بچێتە لای سەرۆکی شارەوانی زۆر بەئەدەب دەچۆ پێشەوەو قسەی لەگەڵ دەکرد •

## « ژان چۆن بوو بە شامپ »

ڕۆژێك ( مادلن ) لەشارەوانی خەریکی کاری خۆی‌بوو ، فەراشەکەی چوو گوتی : ( ژاور ) دەی‌هەوێ بێتە لات • هەر چەند پێی ناخۆش‌بوو ، بەلاَم ووتی : با بێ • ( ژاور ) چـۆ ژورەوە زۆر بەئەدەب سەلامی کرد ، بەلاَم سەرۆکی شارەوانی گوێی نەدایەو هەر خەریکی نامەکانی بەردەستی بوو •

(ژاور) چۆ پێشترەوە ڕاوەستا • (مادلن) قەڵەمەکەی داناو ڕوی‌کردە (ژاور)و گوتی:چ‌بووە؟چ‌کارێکت هەیە؟بۆ هاتووی ؟ (ژاور) بەکزیەوە گوتی : کارێکی خەراپ ڕووی داوە • ـ گوتی : چ کارێك ؟

ـ ووتی : یەکێك لەکار بەدەستان بۆتە هۆی خەتابار کردنی کار بەدەستێکی دەوڵەتیو من بەپێی وەزیفەم هاتم عەرزت بکەم • (مادلن) گوتی : کامــە بۆتە هۆی خەتابار کردنی کسێ ؟ (ژاور) لە وەڵامــدا گوتی : من بوومە هۆی خەتابارکردنی تۆ • (مادلن) لەسەر کورسی‌یەکە هەستاو (ژاور) گوتی : دەبێ من لەوەزیفە دەرکەیو سزام بدەی • ـ جەنابی سەرۆکی‌شارەوانی تۆ رۆژێك عادلانە لەگـ ڵ من رفتــارت کردووە دەبێ ئێستاش عادڵبی • سەرۆکی شارەوانی ئاخێکی هەڵکیشاو گوتی : مــەبەستت چیــە ؟ تۆ بەرامبەر بەمن چیت کردووە ؟ زۆرم لاسەیرە ؟ (ژاور) هەناسێکی قووڵی هەڵکیشاو گوتی : بەو زووانــە دەزانی •

ئاغای سەرۆکی شارەوانی شەش حەوت هــەفتە لەمەوبەر قینم هەستا تۆم تاوانبارکرد • ـ لە کوێ ؟ ـ لەدایرەی پولیسی (پاریس) • ( مــادلن ) پێکــەنیو گوتی : هەر لەبەر ئەوە شکایەتت لێ‌کردم کەسەرۆکی شارەوانیمو دەخالەت لەکاری پۆلیسدا دەکەم ؟ ـ نەخەیر بە ناوی بەندی‌یەکی پێشوووە خــەبەرم لێ‌داوی • بە بەتاقەتیەکەتو بەکارەساتی عەرەبانە چیەکەو بەوەی کە ئاوا ئەوشارە بەباشی بەڕێوە دەبەی دەمزانی (ژانوالژان)ی بەناوبانــگی •

(مــادلن) ڕەنــگی گۆڕاو گوتی : چی ؟ بەناوبانــگ ؟ بەڵێ (ژانوالژان) زیندانی‌بوو ، گۆیا لەپاش ئازاد بوونی چووەماڵی قەشەی تالان کردووەو کاروانێکیشی ڕووت‌کردۆتەوە ، هەشت ساڵ بوو نەدەزانرا لەکوێیە • ئاخری من تۆم بە (ژانوالژان)زانیو چووم خەبەرم لێ‌دای• (مادلن) لەسەرخۆ گوتی : ئەی چیان وەڵام دایەوە ؟ لەوەڵامدا نووسی بویان ئەوەشێتی ؟ باوەڕیان پێ‌نەکردم • حــەقیشیان بوو ، چونــکە

ژانواڵژان گیرابوو • (مـــادلن) بەسەرسوڕمانەوە گوتی : چۆن ؟ ـ قوربان لەنزیك (آیلی‌لوهوت‌کلوت) پیاوێك دەژیا ناوی (شـامپ‌ماتیو) بوو ، زۆر فەقیربوو ، کەس موبالاتی پێ نەدەکرد • ئەو زستانە لەســەر سێو دزین گیرا ، لەبەر ئەوەی وەزعی بەندیخانەی ئێرە خەراپ بوو ، بردیان بۆ بەندیخانەی (آراس) •

لـــەوێ بەندی‌یەك بەناوی (بەروە) کـــە چاوی پێ‌دەکـــەوێ دەی‌ناسێتەوە دەڵێ : ئەوە (ژانواڵژان)ەو بیست‌ساڵ لەمەوبەر پێکەوە لەبەندیخانەی (تولون)دا گیرابوین • خولاسە پۆلیس ڕونی دەکـەنەوە کـە ئەو (شامپ‌ماتیو)یە سیی‌ساڵ لەمەوبەر گوڵ هەڵـگرەوە بووە باشـە ئەی چۆن بوو بە (شامپ‌ماتیو ؟ کـە لەبەندیخانە رزگاری دەبێ ناوی خۆی دەنێ (ژان)و دایکیشی ناوی (ماتیو)بووە لەگـەڵ ناوەکەی خۆی تێکەڵی دەکا دەبێتە (ژان‌ماتیو) • دەچێتە ڕۆژ ئاوای شاری (ادرون) • دانیشتوانی ئەو شارە ژان بەشان دەخوێننەوە دەبێتە (شان‌ماتیو) ئێستاش ناوی خۆی ناوە (شامپ‌ماتیو) بێجـــگە لەوەش دو گرتووی دیـکەش ناسیویانەتەوە و بەرەو ڕوی‌خۆی گوتویانە : تۆ (ژانواڵژان)ی • لـــەو کاتەدا بوو کەچوم تۆم بە ناوی (ژانواڵژان)بە پۆلیس ناساند • بـەڵام ووتیـــــان : ئەوە تۆ شێت بووی ؟ (ژانواڵژان) گیراوە ، ئـــەوەتا لەبەندیخانەی (آراس)دایەو سەرۆکی پۆلیسخانەش ئێستا داوای منـی کردووە ، چونـکە بەیانی ڕۆژی دادگایی کردنیەتی ، دەبێ بـــە ناوی شاهید لەوێ حازر بم • دەبێ ئیمشەو بڕۆم •

( مادلن ) بەنارەحـــەتیەوە گوتی : باشـــە مەحکەمەکەی چـــەند دەخایەنێ ؟ ـ بەلای‌زۆرەوە رۆژێك ، بەڵام مـــن کەشاهیدیەکەمـدا دەگەڕێمەوە • (ژاور) خوا حافیزی کردو هاتەدەرەوە •

# « تۆفانێك لەمێشكێكدا »

بێشك خوێنەرە بەرێزەكان تێ گەیون كە مادلن (ژان‌والژان)ی ڕاستی‌یەو ئێمە نامان هەوێ لێرەدا لەوە زیاتر ڕونی كەینەوە ، بەلام (ژان‌والژان) كاتێ پارەی مندالەكەی كەناوی ( پتی‌ژروە )بوو ، هەلگرتەوە ، بە تەواوی گۆڕاو بوو بەپیاوێكی‌ترو ئارەزوی قەشەی (دین‌ی) هاتەدی ، (ژان‌والژان) بەنەهێنی ئالتونەكانی مالی قەشەی فرۆشت‌و هەموو شارەكانی (فەرەنسا) گەڕا تا ئاخری چۆ شاری (سورمر)و بەئارەزوی خۆی‌گەیی • زۆری خزمەتی خەلك‌دەكرد • ئەو هەدەفی سەرەكی بەلاوە دو شت بوو ــ یەكەم ناوی نەزانرێ‌و ژیانی پارێزراوبێ ، دووەم خوا پەرستی • لەدوا ڕۆیشتنی ( ژاور ) كەوتە گۆمی خەیالەوەو ژانی‌كرد ، خۆی بە تاوانبار دەزانی • هیچ چارەی نەبوو ئەوە نەبێ بچێتە بەندیخانەی (آراس)و ئەوەی بەناوی ئەوەوە گیراوە رزگار بكا • بەپەلە رۆیشت‌و نامەیەكی ناردە ژورەوە بۆ رەیسی دادگا ، نووسی بووی ، سەرۆكی شارەوانی شاری (سورمر) دەی‌هەوێ بێ بۆ تەماشاكردنی ئەو دادگا كردنە ئەگەو بفەرموون : رەئیسی دادگا ناوبانگی پیاوچاكی‌و ئازایی‌و بەدینی ئاغای ( مادلن )ی سەرۆكی شارەوانی بیستبوو ، لە پشتی كاغەزەكەی نووسی با تەشریف بێنێ‌و زۆری بەخێرهاتن دەكەین • لەترسی ئەوەی نەی ناسنەوە ، چۆ شوێنێكی تاریك‌و رۆژ نامێكی بەدەستەوە گرت‌و دەستی‌كرد بەخۆ پێوە خافلاندنی •

لەو كاتەدا قازی تەحقیق دەیگوت : ئێمە دزێك ، یاخیەك ، خەتەرناكێك ، بەلایەك • زیندانیەكی كۆن بەناوی (ژان‌والژان) دادگایی

دەکەین • دەوڵەت چەند ساڵبوو بەدوایدا دەگەڕا ، هەشت ساڵ لەمەوبەر دوا ئازاد بوونی لەبەندیخانە چەند جار دزی کردووە • کاروانی ڕوتکردونەوە ، پارەی (پتیژروە)ی دزی ، قازی زۆر بەگەرمی یەك لەدوای یەك تاوانەکانی دەگوت : کابرای هەزاریش وەك لەبانێکی بەر وەبێ نەی دەزانی چۆن وەڵامی بداتەوە •

## « ڕێگای سزا »

کاتی مورکردنی نامەی سزادان هاتبوو • قازیگەورە گوتی : با تاوانبار لەجێگای خۆی هەستێتە سەرپێو قازی دەستی کرد بەپرسیارو گوتی : کابرا هیچ بەڵگەیترت هەیە بۆ بەرگری لەخۆت ؟ تاوانبار کە کڵاوەکەی بەدەستەوە گرتبوو هەڵیدە سوڕاند دەنگی نەدەکردو وای نیشان ئەدا دەتگوت : لەگەڵ ئەویشیان نیە • قازی دوبارە پرسیاری کردەوە • تاوانبار حاڵیبوو ، سەری بەرزکردەوەو ڕویکردە قازیو چاوی تێوەبڕیو لەپاشان تەماشای تەماشاچیەکانو پۆلیسەکانو وەکیلەکانی کردو دەستیکرد بەقسەکردن ، گوتی : هەر ئەوە دەزانم لەشاری (پاریس) ناڵبەندبووم ، بەڵام جێگای تایبەتیم نەبوو ، دەوڵەمەندەکانیش زستانان نەیان دەهێشت خۆم گەرم وەکەم • خەڵك لەتەمەنی چلساڵیدا تەقاعود دەکرێ • من پەنجاو سێ ساڵیشم • پیاو کە پیربوو گاڵتەی پێدەکەن • کچێکم هەبوو لە من کلۆڵتربوو ، جلشۆری خەڵکی دەکرد • ئەویش مردووە • لەشاری (پاریس) هەر (بالوپ)من دەناسی ، بچن پرسیاری لێ بکەن • ئەوقسانەی کردو لەسەر جێگایخۆی دانیشتەوە • خەڵکەکە دەستیان کرد بەپێکەنین • ئەویش لەقاقای پێکەنینیدا • قازی گوتی : (بالوپ)ی مامۆستاشی بانگکرابوو ، بەڵام

خۆی شاردۆتەوە نەهاتووە • ئنجا قازی ڕوی‌کردە تاوانبارو گوتی : دو پرسیاری زۆر گرنگم ماوە بەوردی وەلآمیان بدەوە • یەکەم ئایا تۆ بەدیواری باغی (پی‌رون)دا سەرکەوتووی‌و لەخە سێوت شکاندووەو سێوت دزیوە ؟ دووەم ئایا تۆ (ژان‌والژان)ی یانا ؟

تاوانبار سەری بەرزکردەوەو گوتی : لەپێش هەموو شتێکداو ، بێ دەنگ‌بوو • قازی تەحقیق گوتی : باش تێ‌فکرە وەلآمی پرسیارەکەت نەدایەوە ، بێ‌دەنگی دەبێتە هۆی تاوانباریت ، ئاشکرایە تۆ ناوت (شامپ‌ماتیو) نیە ؟ ناوت (ژان‌والژان)ە • گوتی : ئاغایانی قازی بەمەوزوعەکە ڕادەگەن‌و ئینکاری فائیدەی نیە •

تاوانبار لەجێگای خۆی هەستاو بەتوندی گوتی : ئاغا ، تۆ ، بەلێ تۆ ، زۆر خەراپی • من قەت هیچم نەدزیوە • من ڕۆژێ تا ئێوارە شتێکم بۆ خواردن پەیدا دەکرد • ڕۆژێك لە خیابان پیاسەم دەکرد لەخە سێوێکم چاو پێکەوت کەوتبوو چەند سێوی پێوە بوو ، هەلمگرتەوەو نەمزانی تووشی ئەو دەردە سەریە دەبم • ئێستاش تۆ دژی من قسە دەکەی ، دەش‌لێی وەلآمم بدەوە ؟ ژاندارمەش سیخوڕمم تێ دەکوتی‌و دەلێ : وەلآم بدەوە • تۆ زۆر لەسەهو دای من دزنیم ، تەنیا لەخە سێوێکم هەلگرتۆتەوە ، ئەوەش جورم نیە • قازی تەحقیق ڕوی‌کردە ڕەئیسی دادگاو گوتی : ئاغای ڕەئیس تاوانبار ئەحمەقی نیشان دەدا ، داوا لە بەڕێزتان دەکەم دوبارە شاهیدەکان بانگ بکە تا بەحزوری خۆی شاهیدی لەسەر بدەن • قازی ئەمری کرد بیان هێنن • زۆری نەخایاند ئەفسەرێك‌و ژاندارمێك بەندی‌یەکی پیریان بە ناوی (بروە)هێنا • تەماشا چیەکان هەستیان لەخۆیان بڕی ، سەر تاپا بوونە گوێ • قازی ڕوی‌کردە (بروە)و گوتی:

ئاگات لەخۆت بێ ، وەڵامی پرسیارەکانی من لەوانەن بنە هۆی لـــەناو بردنی مرۆڤێك ، ڕاست وەڵام بدەوەو جوان تەماشاکـــەو بزانە ئـــەو تاوانبارە ئەو کەسەیە کە لەمەوبەر پێکەوە زیندانی بوونو ژانوالژانە • (برۆ) دە کابرای فکریو گوتی : بەڵێ جەنابی قازی ئەوە یەکـــەم کەس بوو کە لە ساڵی ١٧٩٦ دا هێنایان بۆ بەندیخانەی (تولون)و لەساڵی ١٨١٥ دەشدا ئازاد کرا • من ساڵێك لەدوا وی ئازاد کرام ، دیـــارە تۆزێك ڕەنـگی گۆڕاوە ، بەڵام هۆی پیری یەتی ، مـــن زۆرباشی دەناسم •

قازی گوتی : زۆرباشـە دانیشە • ئنجا شاهیدێکی ترایان بەناوی • (شینلدیو) هێنا کە بەحەپسی ئەبەد حوکم درابوو ، کراسێکی ســـورو کلاوێـکی سەوزی لەسەر بوو کە عەلامەتی حەپسی ئەبەد بوون • قازی هەمان پرسیاری لەویش کردن • کـابرا بەپێکەنینەوە گوتی : بەڵێ دەی ناسم ، منو ئەو پێنج ساڵ بەیەك زنجیر بەسترابووینەوە • ئنجـــا یەکی تریان بەناوی ( گوش‌بیل ) هێنا ، ئەویش حەپسی ئەبەد بوو • شاهیـدی دا گوتی : جەنابی قازی • ئەوە (ژانوالژان)ە • بـــە شاهیدی ئـەو شاهیدانە خەڵکەکە ئاوروژا • تاوانباریش بەسەرسامیەوە گوێی ڕاگرتبوو• قازی ڕوی تێ‌کردو گوتی : گوێت لەشاهیدیەکەیان بوو ؟ ئایا قسەت ماوە؟ تاوانبار گوتی : دەڵێم زۆر باشـە •

غەضبە غەضب لەناو تەمـــاشا چیەکان پەیدابوو ، بەڵام دیار بوو تاوانبار ئاگای لەخۆی نەبوو ، نەی دەزانی دەڵێ چی •

لەو کاتە ناسکەدا ، یەکێك بەدەنگێکی زۆر بڵند لەگۆشەیەکـــەوە گوتی : ئەی شاهیدەکان • ئـەو دەنگە ئەوەندە لەکاتی حەساسدا هـاتو ئەوەندە بەسامبوو ، خەڵك خوێنی لەلەشدا وشك بوو •

تێکڕا ڕویان کردە لای دەنگەکە • تەماشایان کرد پیاوێك لە ریزی تەماشا چیە تایبەتیەکانی پشت سەری قازی‌یەکان هەستایە سەر پێی‌و هات لەناوەڕاستی ساڵۆنەکەدا ڕاوەستا •

(شامپ‌ماتیو) هێندەی دیش سەرسام بوو • ئەو پیاوە ئاغای (مادلن)بوو • کڵاوەکەی بەدەستەوە گرتبوو ، دوگمەی باڵتۆکەی داخستبوون • هەموو خەڵکەکە چاوی‌تێوە بڕی ، هاتە لای شاهیدەکان‌و گوتی : ئێوە من دەناسن ؟ بەچاو پێکەوتنی هەر سێکیان مات‌و سەرگەردان لەشوێنی خۆیان وشك بوون‌و بەسەر ڕاوەشاندن وەڵامی مەنفیان دایەوە • (مادلن) ڕوی کردە قازیەکان‌و گوتی : ئاغایان ، تاوانبار ئازاد بکەن‌و من‌بگرن ، چونکە تاوانباری ڕاستەقینە منم‌و (ژان‌واڵژان)م •

هەناسە لە هەموو سینگێکدا خەفەبوو ، حاڵەتێکی پڕ لەترس‌و وەحشەت ساڵۆنەکەی پڕکرد ، تەنانەت قازیەکانیش پەژارە دای گرتن

قازی تەحقیق بەسەر سوڕمانەوە ڕوی کردە قازیەکان‌و گوتی : ئاغایان ئەوە کارەساتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو ، بو بەهۆی ناڕەحەتی دڵی ئێمەش‌و تەماشاچیانیش • هەستێکی وای لە دڵ‌و دەرونماندا بزواند باسی ناکرێ ـ ئێوە هەمووتان سەرۆکی شارەوانی شاری (سورمر) دەناسن ـ یا ناوبانگتان بیستووە • ئەگەر دوکتۆرولەناودایە زۆر سپاسی دەکەین ئاغای (مادلن) ئارام بکاتەوە • (مادلن) قسەکانی قازی بڕین‌و گوتی : جەنابی قازی زۆرت سپاس دەکەم ، من شێت نیم • ئێوە خەریك بوون خەتاو تاوانێکی گەورە بکەن • ئەو پیاوە تا زووە ئازاد بکەن ، چونکە ئەو تاوانبارەو ئەو بەندی‌یە بەدبەختە منم • ئەوەی کە من دەی ڵێم : خواش پێی‌خۆشە •

گوتی : تا لێرەم دەتوانن بمـگرن • مـن بەناوی نەهێنی ژیاوم‌و دەوڵەمەند بووم‌و بوومە سەرۆکی شارەوانی • من نام هەوێ داستانی ژیانی خۆم بۆ ئێوە وەگێرم ، چونکە رۆژێك خۆتان پەی پێـدەبەن • ئەوە من‌بووم کـە دەستم گەیاندە ماڵی‌جەنابی قەشەی شاری (دین‌ی) ، ئـەوە من بووم پارەی پتی ژرووەم دزی • ئەوەی بەئێوەی گوتووە : (ژان‌واڵژان) مرۆڤێکی بێ‌نرخە ڕاستی‌کردووە • من لە ئەووەڵـەوە دێهاتیەکی هەژار بووم ، بەڵام ئەحمەقیان کردم ، بوومە شـەڕانی ، بەندیخانە فێری هەزار شتی‌کردم • لەپاشان گۆڕام بەپیاوێکی‌تر ، ئێوە ئەو مەوزوعـە نازانن ؟ جـەنابی قازی تەحقیق سەر بادەداو دەڵێ : شێت‌بووە • (مادلن) دەڵێی جارێ هیچ نەبێ ئەوکابرا یە حوکم مەدەن ؟ ئنجا ڕوی‌کردە شاهیدەکان‌و گوتی : من ئێوەباش دەناسم ، ڕوی‌کـردە (بروە)و گوتی : لەبیرت ماوە لەبەندیخانەدا دۆخینی شەڵوارەکـەت هەموو گرێ‌بوو ؟ (بروە) وەك بکەوێتە گۆمێکەوە واقی وڕماو چـاوی تێوە بڕی • ئنجا ڕوی‌کردە (شینلدیو)و گوتی : تۆ ئەوە نەبووی ؟ کـە سەرشانی خۆت هەموو سوتاند بۆ ئەوەی کوتانەکەی سەرشانت نەهێڵی کـە بەحەرفی ت ف ، پ کوترابوو ؟ وەرە پێشـەوە بزانم وانیـە ؟ (شینلدیو) گوتی : بەڵێ وابوو • ڕوی‌کردە (گوش‌پیل)و گوتی : ئەی‌تۆ باسـکی چەپت مێژووی پیادە بوونی ئیمپراطور ( درکان )ی لـە سەر هەڵنەکەندرابوو کە ساڵی ١٨١٥ دەیە ؟ داوەرە پێشەوە بزانم وانیـە ؟ (گوش‌پیل) فەقیانەکـەی هەڵدایەوە تەواوی خەڵکەکە تەماشایان‌کرد وابوو •

(ژان‌واڵژان) بەپێـکەنینەوە ڕوی‌کردە دانیشتوان‌و قازیەکان‌و گوتی : ئەوە پێکەنینی سەرکەوتنـە ، پێکەنینی نائومێدی‌و بێ‌بەشیە •

گوتی : خۆ ئێستا دەزانن کە من (زانوالژان)م ؟

ئەو سالۆنە بێدەنگ‌بوو ، دەتگوت : نە قازی‌و نە تاوانبارو نە زاندارم‌و نە بینەری لێ نەماوە ، هەر دڵبوو لێی دەداو هەر چاو بوو لەگڵێنە چاو هاتبۆ دەرەوەو بەمۆلەق وەستا بوو • رەئیسی دادگا لەبیری چۆوە کە بۆ سەر پەرشتی دادگا هاتووەو بەڵێندەر ئاگای لەخۆی نەماو دەتگوت : (مادلن) سیحری لێ کردوون • ئنجا ڕوی تێکردن‌و گوتی : ئاغایان لەوە زیاتر ناڕەحەت‌و ناکەم • ئەگەر ناشم گرن ئەوا ڕۆیشتم ، چونکە کارم زۆرە ، هەرکاتێ قازی تەحقیق ویستی دەتوانێ بمگرێ ، چونکە دەزانی دەچمە کوێ •

ئەوەی گوت‌و هاتەدەرەوە • قازیەکانیش تاوانباریان بەردا ، وەك مەڕی گێژو سەراسیمە دادگای بەجێ هێشت •

## « نەخۆشی دایکی گەزیە »

بچینەوە سەر باسی دایکی ( کەزیە ) • دایکی ( کەزیە ) کە بۆکار کردن هاتبۆ شاری (سورمر) چەند مانگ بوو لەنەخۆشخانە کەوتبوو • پەرستارێك‌و دوکتۆرێك چاودێریان دەکرد شەوێك تای هاتبۆیە خەوی لێ نەکەوت تابەری‌بەیانی • کە رۆژ بۆوە ( مادلن ) چوو بۆ ئەحوال پرسی ، لەو کاتەدا دوکتۆر لەژوری تاقی‌کردنەوەدا خەریکی تێکەڵ‌کردنی دەرمانان بوو ، ئاگای لەخۆی نەبوو دەرگاکرایەوە ، کەسەری بەرزکردەوە ڕوانی ئاغای ( مادلن ) لەبەرامبەری وەستاوە ، بەترسەوە هاواری‌کرد ـ تۆ (مادلن)ی ؟ لەوەڵامدا گوتی : ئەو ژنە بەدبەختە چۆنە ؟ باشتربووە ؟ ووتی : قوربان

ئەوێ دی زۆر نەخۆش بوو ، بەڵام ئێستا باشترە • لای وایە سەرۆکی شارەوانی چووە کچەکەی بۆ بێنێ • گوتی : بەڵام ئەگەر وەخـەبەر هات و چاوی بە تۆ کەوت کچەکەت نەهێناوە دەبێ چبکا ؟

(مادلن) گوتی : خوا یارمەتیمان بدا ، ئێستا دەتوانم چـاوم پێ بکەوێ ؟ دوکتۆرە گوتی : بەڵێ فەرموو ئەوە ژوورەکەیەتی • ( مادلن ) بەهێواشی دەرگاکەی کردەوە ، چۆ لای سەری خەوی لێ کـەوتبوو ، ڕەنـگی زەرد ببوو ، زۆر کزببووبوو ، دەتگوت : گیـانی لـەبەردا نەماوە • لـەپاش بەینێك چاوی هەڵێنان و چاوی بە (مادلن) کـەوت ، بەزەردە خەندەوە گوتی : ئەی کوا (کەزیە) ؟

## « فانتین خۆشحاڵ دەبێ »

ڕوی کردە (مادلن)و گوتی : خۆ دەمزانی لەسەفەرەکە گەڕاویەوە هەر چەند من نووستبووم ، بەڵام چاوم هەر لەتۆ بوو • ئەی بێم ناڵێی ( کەزیە ) لەکوێیە ؟ بۆ نـەت هێنـایە ناو جێگاکەمەوە تا زو چـاوم پێ بکەوتایە • (مادلن) نەیزانی چۆن وەڵامی بداتەوە ، لەو کاتەدا دوکتۆر هـاتە ژورەوە گوتی : بێدەنگ بە کچەکـەت لێرەیە • لەخۆشی ئـەو موژدەیە چاوی ڕون‌بوونەوەو ناوچـاوانی گەشایەوەو گوتی : ئۆخـەی دەبی هێنن بۆلام ! لە ئاوێنەی ژیهنی ئەودا ( کـەزیە ) ئێستا هـەر ئەومنداڵە بوو کـە کاتی خۆی دەباوەشی دەگرت • دوکتۆرە گوتی : ئاخر تۆ تات هاتۆتێ ، بەچاو پێ‌کەوتنی ناڕەحەت دەبی ، با چاك وەبی جـا دێتـە لات •

(فانتین) قسەی دوکتۆرەی بڕی و گوتی : دوکتۆر چاك بوومەوە ،

گوتی : دوکتۆر ئەوە شێت بووی ؟ من دەبێ چاوم پێبکەوی . دوکتۆر بە هیواشی ووتی : بڕوانە چەند گەرمی ، تا ئاوابی ڕێگا نادەم . کە چاك بویەوە بۆت دێنین .

ووتی : باشە دوکتۆر تورە مەبە خۆم ڕادەگرم . بەڵام دەزانم چاو پێکەوتنی ناڕەحەتم ناکا ، لە دوێنێوە لەبەر چاوم لانەچووە ، هەرچاوم لێیە . (مادلن)لای قەرەوێڵەکەی دانیشتبوو ، (فانتین) ڕوی تێکردو گوتی : جەنابی سەرۆکی شارەوانی سەفەرەکەت خۆش‌بوو ؟ چەندت پێچوو ؟ چەندم پێخۆش‌بوو چووی بۆکچەکەم ؟ ئەرێ حاڵی چۆنە ؟ لەو سەفەرەدا ناڕەحەت نەبوو ؟ فەقیرە ڕەنگە ئێستا من نەناسێتەوە . (مادلن) لەسەرخۆ گوتی : (کەزیە) کچێکی زۆرجوانەو حاڵی زۆرچاکە ، بەو زووانە دەی‌بینی ، خۆت ناڕەحەت مەکە . ( مادلن ) چوو بوو چەند قسەی‌تری پێ بلێ : لەوکاتەدا دوکتۆر چوو دەرەوە هەر ( مادلن )و پەرستارەکە لەلای بوون . لەنکاوێك هاواری کرد ـ ئاخ گوێم لەدەنگی بوو . منداڵی ژنە کرێکارێك لەحەوشی نەخۆشخانەکەدا یاری‌دەکرد ، وەی زانی دەنگی (کەزیە)ی کچیەتی . لەبەرخۆیەوە هەر دەی بزرکاند . ( مادلن ) گوێی لێ گرتبوو ، لەپڕ لەقسەکەوت‌و سەری بەرزکردەوەو گورج بەپاشداکەوتەوەو چاوی لەدەرگاکەوە بڕی . (مادلن) بەسەر سوڕمانەوە گوتی : ئەی خوای‌گەورە ئەوە چی‌بوو ؟ ـ فانتین ـ فانتین ؟ هیچ وەڵامی نەدایەوەو هەر چاوی زەق لەدەرگاوە بڕی بوون‌و بەدەست ئیشارەی بۆ (مادلن) کرد کەبڕوانێتە پاش خۆیەوە . (مادلن) کەبۆ دواوە ئاوڕوی دایەوە چاوی بە (ژاور) کەوت وەستا بوو .

# « دادگەری دەوری خۆی دەبینێ »

(فانتین) توانای تەماشاکردنی ناوچاوانی سامناکی (ژاور)ی نەبوو، دەستی بەچاوانەوە گرت‌و گوتی : جەنابی (مادلن) رزگارم کە •

(مادلن) کەلێرە بەدواوە بە (ژان‌والژان) ناوی دەبەین بە هێواشی گوتی : ئارام‌بگرە ، ئەو پیاوە کاری بەتۆنیە ، ڕوی‌کردە (ژاور)و گوتی: دەزانم چ کارێکت هەیە • (ژاور) گوتی : کەواتە پەلەبکە •

(فانتین) بەبیستنی ئەو قسانە سەری بەرزکردەوەو چاوی هەڵێنا ، سەرۆکی شارەوانی ڕاوەستابوو • (ژاور) هاتبۆ ناوەڕاستی ژورەکەو گوتی : ئەوە نات‌هەوێ وەڕێ کەوی ؟ ( فانتین )ی بەدبەخت تەماشایەکی‌کرد لەدەورو بەری (مادلن)و پەرستارەکە نەبێ ، کەسی‌تری لێ نەبوو گوتی : دەبێ ئەوپیاوە لەگەڵ کێ ئاوا بێ ئەدەبانە بدوێ ؟

وەی زانی لەگەڵ‌ویەتی ، لەترسان لەرزی ، بەڵام لەپڕ شتێکی وای دی ، کە لەخەویشدا نەی‌دی‌بوو ، بەخەیاڵیدا نەهاتبوو ، تەماشای کرد کابرای پۆلیس یەخەی سەرۆکی شارەوانی گرتووەو ئەویش دەنگ ناکا سەری بەرداوەتەوە • دنیای لەپێش چاوان تاریك بوو •

(ژاور) یەخەو گراواتی (ژان‌والژان)ی گرتبوو لەقاقای پێکەنینی داو گوتی : ئێتر ئاغای سەرۆکی شارەوانی نامێنێ •

ژان‌والژان گوتی : (ژاور) سێ ڕۆژ مۆڵەتم بدە تا بچم کچی ئەو ژنە هەژارە بێنمەوە ، چیشت دەوێ ئەی‌دەم ، یان وەرە لەگەڵم •

(ژاور) تەڕاندی‌و گوتی : نەمزانی ئەوەندە بێ‌عەقلێ ، بەو ناوەوە دەت‌هەوێ سێ ڕۆژ ئازادبی ؟ (فانتین) کە گوێی لەو دەنگ‌و باسەبوو ،

لەرزیو گوتی : کچەکەی من ؟ بچی بەدوای کچەکەیمندا ؟ کەواتە لێرەنیە ؟ ڕوی کردە پەرستارەکەو گوتی : خوشکم پێم بڵێ : (کەزیە) لەکوێیە ؟ جەنابی سەرۆکی شارەوانی ، ئاغای (مادلن) کچەکەم دەوێتەوە • (ژاور) نەڕاندیو پێی بەعەرزداداو گوتی : ئیتر (مادلن)و سەرۆکی شارەوانی نەمان • (مادلن) دزە ، زوو لە بەندیخانەدا بوو ، ناوی (ژانوالژان)ە • تازە گرتومە • (فانتین) سەری بەرزکردەوو بەدەستە لەرزۆکەکانی خۆی هەڵکێشایە سەر قەرەوێڵەکەو دانیشت • تەماشایەکی (ژانوالژان)و (ژاور)و پەرستارەکەی کردو خەریك‌بوو قسە بکا • لەنکاو نوزەیێکی لێ‌هاتو بەپاشدا کەوت • دەمی داپچڕاو چاوی دەریەڕین‌و مرد •

(ژانوالژان) زۆر ناڕەحەت بوو بە (ژاور)ی گوت : تۆ کوشتت • لەوەلامدا ووتی : من نەهاتووم گوێ لەئامۆژگاری بگرم ، پۆلیسەکان لەخوارێن ، ئەگەر نایێی ؟ با بانگیان کەم ؟

(ژانوالژان) چوو شیشە ئاسنێکی هێناو چاوی دە (ژاور)ەوە بڕی • خەریك بوو ڕاکا ، پۆلیسەکان بانگ‌کا ، بەلام لەبەر ئەوەی مەبادا لەو کاتەدا (ژانوالژان) بەفرسەتی بزانیو ڕاکا ، چوو پاڵی بە دەرگاکەوە ناو ڕاوەستا •

(ژانوالژان) ئەنیشکی خستە سەر میلە ئاسنەکەو سەری کردە سەر پشتە دەستیو دە (فانتین)ەوە ڕاما •

سیمای فانتین نوورانی دەهاتە بەرچاو بە ڕاستی مردن دەروازێکە بۆ ڕوناکاییکی گەورە دەکرێتەوە • لەپاشان (ژان) ڕوی کردە (ژاور)و گوتی : ئیتر لە ئیختیاری تۆدام !

# « گۆڕستانێکی گونجاو »

ئـەو شەوەی گیرا ، پیرێژنە خزمەتکارەکەی لـەژوری خـۆی دانیشتبوو ، بیری دەکردەوە ، خەیاڵی ڕۆی‌بوو ، چونکە کارخـــانە داخرابوو ، دەرگاکانی قفڵ درابوون • شار مات‌و بێ‌دەنگ‌بوو • دو راهیبـە نەبێ کەس لەو بیناگەورەیەدا نەمـابوو • ئـەو دو فەقیرانەش چاویان دە تەرمی (فانتین)ەوە بڕی‌بوو • ئێوارە کە وەختی گەڕانەوەی (مادلن)هات ، وەك جاران خزمەت چیەکەی هەستا کلیلی ژورەکـــەی لەچەکمەجـــەکە دەرهێناو شەمعـــدانێکی هەڵـگرت‌و چوو بۆ لای بلیکانەکان • شەمعدانەکەی لەوێ داناو کلیلەکەی بەبزمارێکدا کـرد • چونـکە (مادلن) عادەتی وابوو کەئێواران دەهاتەوە کیلی‌وەر دەگرت‌و شەمعێـــکی هـەڵدەگرت‌و دەچـۆ ژورەکـەی خۆیی • پیرێژن وەك چاوەڕوانی ئاغاکەی بـکا چۆوە لەسەر جێگای خۆی دانیشتەوە • یەك دو سەعات تێ‌پەڕین • لەنکاوێك پیرێژن هەستایە سەرپێ‌و گوتی : ئاخ، خوایە ! کلیلی ژورەکەم بەبزمارێـکەوە هەڵواسیوە ؟ لەو کاتەدا یەکێك وەژورکەوت‌و کلیلەکەی لێ‌کردەوەو شەمعەکەی هەڵگرت • پیرێژن لەترسان قوڕگی‌گیرا ، نەی توانی هاوارکا ، چونکە دەست‌و پەنجـــەو لیباسەکەی ناسیەوەو وای زانی ئاغای (مادلن)ە • ماوەیەك بێ دەنگ‌بوو، ئاخری هەستا گوتی : ئۆخـــەی ، خوایە ! ئاغای (مادلن) • خـــۆ واومزانی تۆ لە ••

چونکە لای وابوو ئێستا ئەو هەر سەرۆکی شارەوانیە • ئاخـری قسەکـەی بەباش نەزانی‌و بەنیوەچڵی بەجێی هێشت • ( ژان‌والژان ) بۆی‌تەواو کردو گوتی : لەبەندیخانەدای ؟ بـــەڵێ لەوێ‌بووم ، بەڵام

شیشێکی پەنجەرەکەم هەڵکەندو خۆم گەیاندەوە تیرە •

گوتی : دەچمە ژورەکـــەی خـــۆم ، بچۆ خوشـکە ڕاهیبەم بۆبانگ کە ، دەزانم هەر بەدیار ئەو جەنازەوە دانیشتووە ؟

(ژانوالژان) چۆ ژورەکـــەی خۆیو پەنجەرەکانی داخستن‌و پارچە کاغەزێـکی هێنا ، نووسی ئەوە ئـەو پارەیە کە لە (پتی‌ژروە)م دزی‌وە و ئەو شەمعدانانەش جەنابی قەشە دایمێ • کراسە کۆنێـــکی هێناو کردیە دو پارچەو پارەو شـەمعدانەکانی تێوە پێچان ، بەڵام زور سەیر بوو ، نە پەلەی دەکردو نەدیاربوو بترسی • لەنکاو دوو پتـەیان لەدەرگادا ، گوتی : فەرموو ڕاهیبە بوو ، ڕەنـگی ڕوانی پەڕی بوو ، چاوی سور ببوون ، شەمعەکەی بە دەستەوە دەلەرزی • کاغەزەکەی دایە دەست ڕاهیبەو گوتی : خوشکە گیان ئەو کاغەزە بدە بە قەشەی شارو ئەگەر حەزیش دەکـــەی وەی‌خوێنە • کە تەماشای کرد نووسرابوو لەباوکی ڕوحانی داوا دەکەم بنە خاوەنی ماڵەکەم‌و خەرجی دادگاکردنی من‌و پارەی کفن‌و دفنی ئەو ئافرەتەی لێ‌بدەو باقیەکەی بدە بەفەقیران • ڕاهیبە گوتی : بۆخەیاڵت وایە بەجێمان بێڵێ ؟ گوتی : بەڵێ ، چونـکە بەدواندا دەگەڕێن • قسەکەی تەواو نەکرد لەنـکاو گوێی لێ‌بوو یەکێك دەیگوت : ئاغا بەخوا کەسم‌نەدیوە ، لەو دەرگایە دور نەکەوتوومەوە • گوێی لەدەنـگی پیاوێکیش بوو گوتی : لـــەو ژورەدا ڕوناکی دیارە ، زانی کە دەنـگی (ژاور)ە • خێرا شەمعەکەی کوژاندەوە خۆی گەیاندە قوژبنێك • راهیبە بەچۆکداهاتبوو ، (ژاور) وەژور کەوت • دەنـــگی چەند کەسی‌ترو خزمەت کارەکەش لای پلیکانەکان دەهات • (ژاور) کەچاوی بە (ڕاهیبە) کەوت لەجێی خۆی ڕاوەستاو خەجاڵەت بۆوە ، چونـکە ( ژاور ) پیاوێـکی دین‌دۆست بوو ، زۆری ڕێز لەقەشـــەو

کەشیش‌و راهیبە دەگرت •

(ژاور)لای وابوو کە ئەو (ڕاهیبە) قەت درۆ ناکا • گوتی :خوشکە هەر خۆت لەو ژورە دای ؟ گوتی : بەڵێ • (ژاور) گوتی : عەفوومان کە پیاوێك بەناوی (ژانواڵژن) لەزیندان ڕای‌کردووە نەتان دیوە ؟ گوتی : نەخەیر • (ژاور) خواحافیزی کردو رۆیشت •

لەپاش سەعاتێك (ژانواڵژان) لە تاریکایی شەوداو بەناو دارەکانی شاری (سورمر)دا بەرەو (پاریس) ڕۆیشت •

دایکی (کەزیە)ش وەکو هەموو ئادەمیزادێك دایکێکی هەبوو کە خاك‌و زەوی بوو ، دەباوەشی خۆی گرتەوە •

## « کەشتی اوریون »

(ژانواڵژان)ی قاتیلی موجریم ئەمن گرتی ، تەواوی رۆژ نامەکان لاپەڕەی یەکەمیان بەو دەنگ‌وباسە پڕکردەوە ، لەرۆژی (٢٥)ی مانگی ژوئیـەی ساڵی ١٨٢٣دا لـــە ڕۆژنامەی ( درایوبلانك )دا بڵاو کرایەوە کەشاری (سورمر) کارەساتێکی غـەریبی بەخۆیەوە دی • پیاوێـــکی نەناسراو بەناوی موستەعارەوە ـ (مادلن) ـ ناو چەند ساڵ لەمـەوبەر چوو بۆ ئەوشارەو کارخانەی بازنە سازی‌و شوشەو کارەبای داناو بـــە هۆی‌وریایی‌و زانایی‌و لێ‌هاتوو ییەوە دەیان پەرست • ئاخری کردیان بە سەرۆکی شارەوانی شاری (سورمر) • بەڵام لـــەو ئاخریانەدا پۆلیس ڕونی کردەوە • کە ئەوپیاوە زوو گیراوەو نۆزدە ساڵ لەبەندیخانەدا بووەو ڕای‌کردووەو ناوی (ژانواڵژان)ە • لەپێش گرتنـــەوەیدا نیو ملیون فرانـکی لـــەبانقی (لافیت)دابووە وەری‌گرتۆتەوە ، بـــەڵام

کەس نازانێ چی لێ کردووە ؟ گرتیانو بردیانەوە بۆ بەندیخانەی ( تولون ) •

دوبارە لەرۆژ نامەی (ژورنال دوپاری)دا نووسرابوو ، حەپسێکی بەساڵدا چوو بەناوی ژانوالژان گیراوەتەوە ، لەهەموو کۆڕو کۆمەڵێکدا باسی دەکەن • پیاوێکی زۆر شەڕانیو عەیارو چالاکبووە، چاو بەستی لەکاربەدەستانی دەوڵەت کردووە ، لەبەر چاکیو زرنگیانی خەڵك دەیبەرست ، ئاخری کردیان بەسەرۆکی شارەوانی بەناوی (مادلن) بەڵام لەوماوەیەدا ناسرایەوەو گیرا • دیسان لەزینـدان ڕای کردۆتەوە • دەڵێن : پارەی زۆرە ، بەڵام کەس نازانێ لەکوێیە ؟ بردیان دوبارە بۆدادگا لەبەر ئەوەی هەشت ساڵ لەمەوبەر بەهۆی کاری خەرایەوە حوکمدرابوو ، ئەوجارە حوکمی ئیعدامیاندا ، بەڵام پاشا بۆی کرد بەحەپسی ئەبەد لەگەڵ ئەعمالیشاقەدا • بردیان بۆ بەندیخانەی شاری ( تولون ) •

## « زنجیرێك پچڕا »

لەئاخری مانگی تشرینییەکەمی هەمان ساڵ ـ ساڵی ١٨٢٣ دا بەهۆی ئاڵۆزی وەزعی هەواوە کەشتییەکی گەورە بەناوی اوریون لەکار کەوتو بۆچاك کردنەوەی لەبەندەری (تولون)دا لەنگەری گرت • خەڵکی شار زۆریان بۆ تەماشاکردنی دەچوون ڕادەوەستان • ڕۆژێك کارەساتێکی سەیریان چاو پێکەوت ، کەشتییە وانەکانی خەریکی تەعمیراتی بوون • یەکیان چوو بۆ سەر کۆڵەکە بەرزەکەی سەرەوە کە بۆ ئاگاداری دەچنە سەری تاچاکی بکا ، ئاگای لەخۆی نەماو بە تەقڵە

لێدان سەرەو بن کەوتە خوارەوە • لەبەربوونە وەکـــەیدا دەستێکی لەتەنافێـــك دراو گرتی ، دەستەکەی تریشی بردو توونە خـــۆی وێ هەڵاوەسی • بەڵام کە دەیویست هـــەڵکشێتەوە ، پەتـــەکە باوی دەخواردو زیاتر دەکەوتە مەترسی‌یەوە • خەڵکەکـە هاواری دەکرد ، کەس نەدەوێرا یارمەتی بدا • تەنانەت کەشتی وانەکانیش نەوێران خۆی لەقەرە بدەن • لە نـکاو یەکێك وەك پشیلەی کێوی بەعەموودەکـەدا سەرکەوت ، لیباسی سوری لە بەردابوو ، کڵاوی سەوزی بەسـەرەوە بوو ، وەك لیباسی حوکم دراوێك دەچوو • خەڵك لایان‌وابوو کوڕێکی زۆر گەنجە ، بەڵام کاتێ گەیشتە سەرەوە ، بایەکی توونی هەڵکردو کڵاوەکەی لەسەر فڕاندو مووە سپیەکانی دەرکەوتن ؟ زانیـــان زۆر پیرە ، واقیان وڕما ، بە سەر دارێـکدا ڕۆیی تا گەیشتە ئەو جێـــگایە کە تەنافەکەی پێوە بەسترابۆوە ، یەکێك لەو پەتکانەی کە بەدەستی‌یەوە بوون لە دارەکەی بەستو پێی‌دا چۆ خوارەوە • خەڵکەکە بەتەماشـــا کردنی لێوەلەرزەیان هاتبۆیە ، چونـکە تائێستا یەکێك بوو ، ئەوا بوون بەدوان ، کــە لەبەینی ئەرزو ئاسماندا هەڵاوەسراون • بەهـەر جۆرێك بوو خۆی گەیاندە لای کابراو سەرێـکی یەکێك لە پەتکەکانی لـــەناو قەدی کـــابرا قایم‌کردو سەرەکەی تری لە مەچـەکی خۆی بەستو بەپەتکەکەی‌تردا خۆی‌و کابراشی وەسەر خستەوەو کابرای لەمـەرگ رزگار کردو چۆوە سەر ئیشەکەی خۆی • لە تۆقە سەری کەشتی‌یەکە ئیشی‌دەکرد ، چونـکە هەموو حەپسیەکانیان هێنابوو کاریان پێ‌دەکردن • زوربەی تەماشا چیەکـــان هەر تەماشا ئەویان دەکرد • لەنـــکاوێك هاواریان لێ‌هەستا ، چونـکە بەهۆی ماندوبوونەوە سەرەگێژەی گرتو بەلادا هات‌و سەرەوبن کەوتە ناو دەریاوە • کەشتی‌یەکی تریش لەتەنیشت ئەوکشتی‌یەوە لەنـگەری گرتبوو ، کەوتە ناو هەر دوکیانەوە ، چاو لێ

بوونی زۆر وەحشەت ناڵەبوو ، دەیانگوت : بێگومان دەکەوێتــــە ژێر یەکیانەوەو دەخنــــکێ ٠

چوار کەس چوونە ناو بەلەمێکەوەو خۆیان بۆ تێ هــاویشت ، بەڵام تا شــەو گەڕان نەدۆزراپەوە ٠ بەیانی ڕۆژی داویی ڕۆژنامــــە بڵاوی کردەوە کە دوێنێ ١٧ دەی تشرینیدووەمی ســــالی ( ١٨٢٣) حوکمدراوێك بەحـــــەپسی ئەبەدی بەئەعمــــالی شاقەوە دوا ئــەوەی کەشتییەوانێکی لەمەرگ رزگار کرد ، خۆی کەوتۆتە ناو بەخـــــرو خنــــکاوەو تەرمەکەشی نەدۆزراوەتەوە ٠ ژمــــارەی بەندیخانەی (٩٤٣٠)یەو ناوی (ژان‌والژان)ە ٠

## « وەفابە بەڵین »

لەساڵی (١٨٢٣)دا ئاوایی (مونتغرمی) دێیێکی مام ناوندی بوو ، دانیشتوەکانی زۆر بەئارامی دەژیان ، ڕێــگای بۆشارەگەورەکاندا پێــدا نەدەچوو ، بەڵام کەم ئاو بوو ، کانیاوێکی دور لەئاوایی نەبێ ئاوی لێ نەبوو ٠ دەوڵەمەندەکان ، هەروەها عائیلەی (تەناردیە) پیاوێکی پیریان بۆئاوکێشان ڕاگرتبوو بەپارە ئاوی بۆ دێنان ، بەڵام ئەویش لەســەعات پێنجدا دەستی لەئاو کێشان هەڵدەگرت ٠ ئەگەر یەکێك لەدوا سەعــات پێنج ئاوی بویستایە دەبوو بۆخۆی بچێ بۆئاو ، ئەوە بوو بەهۆی ئەوە کە (کەزیە)ی منداڵ کە ئێوارە دادەهات لەترسی ئاو هێنان بۆمــــــالی (تەناردیە) لێوە لەرزەی دە هاتێ (کەزیە)دو دەوری گرنگی دەدیو دو فائیدەی بۆ مــــالی (تاردیە)هــــەبوو ، بۆبەخێوکردنەکەی پارەشیان وەردەگرت‌و کاریشیان پێ دەکرد ٠ بۆیە کاتێ پارەیان بۆ نەهـــــات (کەزیە)یان دەر نەکرد ٠

(ژان‌واڵژان) نەمرد بوو ، کاتێ کەوتە دەریاوە ، یان بڵێین : خۆی خستە دەریاوە بەمەلە خۆی گـەیاندە ئـەو بەلەمەی بەکـەشتی‌یەکەوە بەسترا بۆوە . تا شـەو داهات خۆی تێدا حەشاردا ، کە شەو تاریك‌بوو بەمەلە خۆی گەیاندە وشکانی‌و دورکەوتەوە . لیباسێکی موناسبی کڕی لەبەری‌کردو ، ملی‌ڕێـگای‌گرت‌و بەناڕەحەتی خۆی‌گەیاندە شـاری پاریس . چوو کراسێکی ڕەشی تازیەی کڕی کە بۆ کچێـکی حـەوت ساڵی دەستبدا . ئنجا بەرەو شاری (مونت‌فرمیل) کەوتە ڕێ‌و شـەو گەیشتەوێ . چوو بەهـەر جۆرێك بوو (کەزیە)ی کچی (فانتین)ی لەماڵی (تناردیە) دزیەوەو گەڕایەوە (پاریس) ، بەیانی ئەو شـەوە گەینەوە (پاریس) . سواری عەڕەبانێك بوون تاگەینە خیابانی (اورسن) لەوێ دابەزین پارەی کابرای داو بەرەو فولکەی (ودەوبی‌تاڵ) کەوتنـە ڕێ . ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای ئەوخانوەی کە پێیان دەگوت : خـانووی (گوربیو)ی پیرە .

## « خانووی غور بوو »

لە ماوەی چل‌ساڵدا ئەگەر بەجادەکانی (پاریس)دا بڕۆیشتیایەی بۆ گەڕەکە ئاوەدانەکانی ، لەپاش ماوەیەك دەگەیشتی‌یە خانویکی کۆن دەرو دیوارەکەی ڕوخابوو ، لە ئاوەدانی دور کەوتبۆوە ئـەو خـانوە یەك‌قات بوو ، دەرگاکانی رزی بوون ، کیلونەکانی مۆرانە خواردبوونی لە ناوەڕاستی ژورە بچوکەکانیدا قاعە یەکێ سەر بەخۆ بوو . ئـەو خانوە مەشهور بوو بە خانووی شێخ غوور بوو .

(ژان‌واڵژان) چوو لەبەرامبەر ئەو خانووەدا ڕاوەستاو لەئاخریدا چۆ ناوی‌و کردی بەسوکنای خۆی . بەکلیل دەرگای دەرەوەی کردەوە

لەگـــەڵ (کەزیە) چوونە ناوی ، بەلای ڕاستــــدا ئاوڕوی دایەوە دەرگایەکی تریشی کردووە ، ئەو ژوورەی چوونە ناوی گەورە بوو ، قەرەوێڵێك و چەند کورسی تێدابوو • لەگۆشەیەکەوە دەرگایەك دەچۆ ژوورێـکی چووکەڵەوە کورسێکی لێ بوو ، چوو شتەکانی داناو هاتەوە ژوورەکەی تر • شەمعێکی داگیرساندو گەڕایەوە بۆلای (کەزیە) ویستی وەك هەموو تەیرو باڵندەیەك هێلانەیەك پەیدا بکا • بەهەر جۆرێك بوو دەرگای دەرەوەی کردەوە و (کەزیە)ی بردە ژوورەوە و دای خستەوە • بەپلیکانەکاندا سەرکەوتن‌و دەرگای ژوورێـکی کردەوە ، حەسیرێك‌و دوو سێ کورسی‌یە شـــکاوی تێدا بوو ، چوونە ژوورو دەرگاکـــەی داخستەوە • ژوورێکی‌تر جێگای نەفەرێـکی لێ ڕاخرابوو ( کەزیە )ی بردەوێو نواندی‌و بەدیاریەوە دانیشت •

بەیانی تیشکی ڕۆژ لەپەنجەرەوەڕا هاتە ژوورەوە ، لە نکاو پرمەو دەنـگی عەرەبانێکی جووت ئەسپی خانوەکەی لەرزاندو ( کەزیە ) لە خــەو ڕاپەڕی‌و هاواری‌کرد ـ دایەگیان ئەواهاتم ، لەپاشان چـــاوی هەڵێنان‌و چـــاوی بـــە ( ژانواڵژان ) کـــەوت پێ‌دەکـــەنی ، گوتی : ئای لەبیرم چوو ئاغا بەیانێت باش •

## « دوو بەد بەخت بە یەکتر دڵشاد دەبن »

(ژانواڵژان) لەدنیادا کـــەسی خۆش نەدەویست ، بیست‌و پێنج ساڵ بەتەنیا ژیا ، نە بوو بە باوك ، نەبوو بەمێرد، نە عاشق‌بوو ، نـــە خاوەن دۆست • خوشك‌و خوشکە زاکانیشی لەبیر چوو بوونەوە • کاتێ (کەزیە)ی هێنایەوەو ڕزگاری کرد ، پیربوو ، گیانی دەلەرزی ، بەلام

بەدیداری ئەو کچە هەستی خۆشەویستی بزوت • کاتێ ( کـــەزیە ) دەنووست دەچۆ لایو دەتگوت : باوکێکی جـگەرسۆزە تەماشـــــای جگەرگۆشەکەی دەکا ؟ لەخۆشەویستیانی مووچرکی پێدا دەهـــاتو گیانی دەلەرزی •

(قەشەی)ی شاری (دین‌ی) هەستی تەقواو پەرهیزکاوی لەدلـدا بووژاندەوەو ( کەزیە )ش هەستی خۆشەویستی • ئافەرین بۆ ئەو مرۆڤە کەبوو بەواسیتەی ئازادی ئەو کچە بێ نەوایەو سپاسیش بۆ ئەو کچـە کە بو بەهۆی ئەوە ، ئەو لەخەراپە بگەڕێتەوە و شەیتـــــان دوبارە بەسەهوی نەبا •

(کەزیە) بێ ئەوەی هەست بەخۆی بـکا زۆر گۆڕابوو ، بەمندالی لەدایـکی جیـابۆوە ، لەخۆشەویستی دایك بێبەش ببوو ، ناخۆشی‌و لێدان‌و جەزرەبەی دی‌بوو ، لەحەوت ئاسماندا ئەستێرەیەکی نەبوو • بۆیە ئەو پیاوە پیرەی خۆش‌دەویست •

( ژان‌والژان ) زۆر زیرەکانە ئەو شوێنەی دۆزیەوە ، زۆر ئەمن‌و ئەمان‌بوو ، خـــۆی بەبازرگانی لێ‌قەوماو لەقەلەم دابوو • خـــاوەن خانوەکەیان پیرێژنێکی هەژار بوو ، لە خانوێـکی بەرامبەریدا بوو ، بەڕۆژ دەهـات ماڵەکەی بۆپاك دەکردنەوەو خزمەتی‌دەکردن • کەزیە (ژان‌والژان)ی بەباوك ناودەبردو ئەویش ( کـــەزیە )ی زۆرخـۆش دەویست •

ژان‌والژان بەڕوناکی نەدەچۆ دەرەوە ، بەلام کەشەو تاریك دەبوو یا بەتەنیا ، یان لەگەل (کەزیە) یەك دوو سەعـــات پیاسەی دەکرد • بەزۆری بەکۆلانی تەنگ‌و تاریـــکدا دەڕۆیی • یان دەچۆ ( کلیسـا )

زۆریان خۆش دەگوزەراند ، بەلاَم خۆی نەگۆری بوو ، هـــەر کۆتە زەردەکە و کراسە ڕەشەکەو کلاَوە کۆنەکەی لەسەر بوو • خـــەلَك وەی دەزانی گەدایە •

تەنانەت جـــاری وابوو ئافرەتی دڵ نەرم کە بەلایدا ڕادەبردن پارەیان دەخستە مستەوە ، ئەویش وەری دەگرت • جـــاری‌واش بوو یەکێکی لەخۆی بەداماوتر دەزانی تەماشا ئەملاو ئەولای خۆی دەکرد ، ئەگەر کەس دیار نەبوایە پارەی دەدایەو بەتووندی دور دەکەوتەوە ئـــەو کردەوەی وا لەشاردا بلاَو بۆوە خەلَك ناویان نابوو گـــەدای خێرکـــەر •

پیریژن وەکو زۆربەی خەلَـکی گەرەك لە ژانوالَژان کـــەوتبۆ گومانەوە بێ ئەوەی ژانوالَژان بزانی تاقیی‌دەکرد • ڕۆژانە زۆری پرسیار لە (کەزیە) دەکرد ، ئەو لەوەلاَمدا هەر دەیگوت : لەمۆنت‌فرمیل هاتووین • تا بەیانیەك چاوی لێ‌بوو (ژانوالَژان) بە پەلـــە جـــۆ کەلاوێکەوەو پشتی کردە لای دەرەوە ، پیرێژن وەك پشیلە بێ‌هەست وەدوای‌کەوت بێ ئەوەی ئەو هـــەستی پێ‌بـــکا • ڕوانی ژانوالَژان دەستی دەباخەلَێ نا • ســـوژنو مەقاستو دەرزی هێنانە دەرێو شاقـــەلی کۆتەکەی هـــەڵ دڕیو وەرقەیێـــکی هەزار فرانـــکی لێ هێنایەدەر • پیرێژن بێ هەست بەسەر سوڕماتەوە گەڕایەوە • (ژانوالَژان) کەهاتەوە پارەکەی دا بەپیرێژنو گوتی : ئەو پارە ئی شتە ، بۆیان فرۆشتووم بچۆ وردی وەکە • پیرێژن چوو وردی کردەوە ، بەلاَم زیاتربوو بەهۆی سەر سوڕمانی •

سوالَ کەرێك هەمیشە لەسەر جادەی گشتی گەڕەکەکە بۆ سوالَ دادەنیشت ژانوالَژان پارەی دەدایەو زۆر جاریش قسەی لەگـــەلَ

دەکرد • شـــەوێك لەگەڵ (کەزیە) بەوێدا ڕۆیشتن لەبەر ڕوناکی گڵۆپی خیابان دانیشتبوو ، سەری بەردابۆوە ، لەبەر خۆیەوە دوعـای دەکرد • (ژانواڵژان) پارەی دایە ، گەداکـــە ســەری بەرزکردەوە تەماشـایەکی کـردو گورج ســـەری بەردایەوە • ( ژانواڵژان ) لێی کەوتە شکەوەو گوتی:ئەوە گەداکەی شەوان نیە ؟ وەك بیناسم وایـە ؟ بەڵام وەك لەنـکاو تووشی پڵینگێك بێ ئاوا پەشۆکـا • نە دەی توانی هەناسە بدا ، نە لە جێگای خۆی بجوڵێ ، نە لە وێ ڕاوەستێ ، نـــە ڕاکـا • هەر ئەوەندەی پێما چاوی تێوە بڕی ، تەنانەت نەی توانی دوو کەلیمە قسەش بـکا •

گەدا هەمان گەدابوو ، هەر لیباسی جارانی لەبەردابوو • لـــەبەر خۆیەوە گوتی : ئەوە مـن شێت بووم ؟ خەونم دیوە ؟ ـ نەء ـ وانیـە ؟ بە پەرێشانی هاتەوە ماڵەوە • لەپاش چەند ڕۆژ لای سەعـات هەشتی شـەو لەژورەکەی خـۆی دانشتبوو ، دەرسی بە (کـەزیە) دەگوت : لەنـکاو دەرگاکە لێ کرایەوەو پێوە درایەوە ، زۆر سەیر بوو ؟ خـۆی مات کرد ، لەپاشان چوو لەکوونی ئاڵقەڕێزی دەرگاکەوە تەماشای کرد یەکێك مۆمێـــکی بەدەستەوەیە لەدەرەوە ڕاوەستاوە گوێی گرتووە • لەپاش چـەند دەقیقە ڕوناکی نەما ، بەڵام لەبەر ئەوەی زەلامـــەکە پێڵاوەکانی دانابوو ، هەستی نەهات • ژانواڵژان بەجلەوە چـــۆ ناو جێگەوەو تا لای بەیانی خەوی لێ نەکەوت ، بەری بەیانی تازە خـەوی لێ کەوتبوو بەدەنـگی دەرگای داڵانەکـــە وەخـەبەر هات ، گوێی لەدەنـگی پێی یەکێك بوو بە قادرمەکاندا سەر کەوتو نزیك‌تر بۆوە •

هەستا چوو لەقەڵشتی دەرگاکەوە ڕوانی بەڵـکو بیناسی ، کـــابرا بەتووندی بەلای ژورەکەیدا ڕۆیشت ، بەڵام لەبەر ئەوەی داڵانەکـــە

تاریك بوو ئەی ئاسی • ژانواڵژن لەپشتی‌یەوە ڕا تەماشای‌کرد زانی کە ئەو زەلامە (زاور)ە • سەعات حەوتی بەیانی پیرێژن هات ژورەکەی بماڵێ ، ژانواڵژان خشپەیکی لێ‌کردو بێ دەنگ‌بوو ، بەڵام ئەو بە گەسك لێ دانەوە گوتی : دۆی شەو ئاگات لەهاتنی کابرابوو ؟

گوتی : بەڵێ ـ بەڵام نەمزانی‌کێی بوو ؟ پیرێژن گوتی : کرێ چی‌یەکی تازەبوو هات • گوتی ناوی چیە ؟ ووتی : نەجیب‌زادێکی وەك تۆیە لام وایە ناوی (دوموںت)ە پرسی چ‌کارەیە ؟ گوتی : بەماڵی خۆی‌دەژی • کە رۆژ ئاوابوو ژانواڵژان چوخیابانو چاوێکی پێداگێڕا کەسی نەدی ، چۆڵ‌بوو ، مەگەر یەکێك لەئوژێنێك خۆی گرتبێ ؟ بە پەلە هاتەوە ، دەستی (کەزیە)ی گرتو ڕۆیشتن •

ژانواڵژان ڕۆیشت هەستی ڕاگرتبوو ، گوێی هەڵخستبوو ، چاوی دەگێڕا ، ڕۆیشتو (کەزیە)ی لە گەڵ خۆی برد (کەزیە) ئاگـــــای لەهیچ نەبوو • دەچۆ زۆر کۆڵانو دەگەڕایەوە ، خۆی دەپەنا دیواران دەگرت ، تا خەڵك نەیان بینی •

مانگ لەبن هەور وەدەر کەوت لەدورەوە پێش‌و دواوەی چاو لێ‌بوو • نە (کەزیە) دەیزانی بۆ کوێ دەچو ، نە ژانواڵژان • خۆیان تەسلیمی خوای گەورە کردبوو •

لەو پەری شـار چوونە گەڕەکی فەقیران بەناوی (دوویت‌مور)ە گەڕان تا چوونە بن‌دیواری خانوێـکی چـۆڵ ، بەڵام داخـــرابوو • ئەگـــەر بۆیان بکرایە بچنە ناوی زۆر شوێنێـــکی ئەمین دیار بوو • بەڵام لەنکاوێك لەنزیکەوە دەنگێك هات • (ژانواڵژان) گــەڕایەوەو لەسیلەی دیواری خانوەکەوە تەماشا خابانی کرد ، جەوت ، هـەشت

سەرباز بەرەو لای‌وان دەهاتن‌و زانی کە گەورەکەیان (ژاور)ە و زۆر بەوردی هەموو کون‌و قوژبنێك دەگەڕێن • بەقەرینە دیار بوو لەمەوپێش (ژاور) ئەمانی دی‌بوو ، تووشی ئەو قەرەولانە ببوو ، لەگەڵ خۆی هێنابوون ، بیان گرن • گرتنی ئەو کەڕەتەی (ژان‌واڵژان) وەك گرتنی جارانی نەبوو ، ئەو جارە بگیرایە (کەزیە) بێ‌کەس دەمایەوە ، ناچاربوو بەهەر فێڵێك بێ‌خۆی رزگار کا • بەچاو بڵندی دیوارەکەی پێوا ، حەقدە پێ دەبوو • قوژبنی دیوارەکە پڕبوو لەخشتە شکاوو بەرد • گرێ‌کوێرەی گەورە (کەزیە)بوو ، چونکە ئەو نەی دەتوانی بەدیوارەکەدا سەر کەوێ‌و بەجێ هێشتنیشی نەدەکرا ؟ ئەگەر لەو کاتەدا گوری سێك ، تەنافێك ، بەهەر ترخێك بوایە لای هەرژان بوو • لەنکاو لەو پەڕی نائومێدیدا سەری بەرزکردەوەو چاوی بەچرای خیابان کەوت • چراکانی فەرەنسا لەوکاتەدا بە پیو دایسان‌و بۆ ئەوەی باوو باران نەیان کوژێنیتەوە،لەناو شوشەدا دایان دەنان•بۆ زیادو کەمیش بەتکێکی دو لایان دەخستە پێچ قتیلەوەو سەرەکەی تریان بەردەدایەوە ( ژان‌واڵژان ) کە ئەوەی دی ، چوو بەچەقۆ هەڵی‌بڕی‌و هێنای ، گراوەتەکەی لەمل دەرهێناو خستی‌یە بن هەر دوو باڵی ( کەزیە ) و پێلاوەکانی تووڕ دایە ئەو دی‌وو ، سەری تەنافەکەی لەهەر دوولای گراواتەکە قایم‌کردو بەددان تەنافەکەی گرت‌و وەدیوارەکە هەڵگەڕا ، نیو دەقیقەی نەخایاند چۆ سەر دیوارەکە • ڕوی‌کردە ( کەزیە )و گوتی : پشت بکە دیوارەکەو مەترسەو دەنگ مەکە • (کەزیە)ی‌ هەڵکێشاو بردی‌یە سەر دیوارەکەو لەکۆڵی کردو بەو دیودا خۆی خزاندە خوارەوە • لەوکاتەدا گوێی لەدەنگی (ژاور) بوو دەیگوت کوچەکە بگەڕێن • سەربازەکان بەگورجی هاتن بۆ گەڕان • (ژان‌واڵژان) لەوێشەوە بەو دیودا بێ‌هەست چۆ خوارەوە •

## « سەرەتای مەتەڵێك »

چوونە ناو باغێکی گەورەی پڕ درەخت•لەناو باغەکەدا خانوێکی کۆن دیاربوو ، بۆ پەناگا دەبوو • هەر چەند پیاوی ڕاکردو قەت لەخۆی ئەمین نیە • پێلاوەکانی دۆزیەوەو دەپێی کردنەوەو چوونە چێشتخانەی خانوەکەوە ، (کەزیە) هەڵدە لەرزی‌و خۆی بەباوەشی (ژان‌واڵژان)ەوە نووساندبوو • لەوکاتەدا دەنگی ( ژاور ) هات کە بەسەربازەکانی دەگوت : باش بگەڕێن • ماوەی چارەگە سەعاتێك بێ دەنگ خۆیان مات‌کرد ، تاهەستی (ژاور)و وان بڕا • لەو ماوەدا دەستی لەسەر دەمی (کەزیە) دانابوو هەستی لێوە نەدەهات • دنیا ئەوەندە کش‌ومات بوو ، دەتگوت : دیوارەکان لەبەردی مات‌و بێ دەنگ تاشراون •

لەوبێ دەنگیەدا لەنکاو دەنگێکی خۆشی فریشتەیی هاتە بەر گوێ ، لەدڵی تاریکی شەودا ترسی لەبیر ئینسان دەبردەوە ، هەر چەند دەنگی کچان‌بوو ، بەڵام دەتگوت : دەنگی فریشتەی ئاسمانەکانە •

دیاربوو لەو خانوە نیوە تاریکەوە دەهات کە لە بەرامبەر باغەکەوە بوو ، بەڵام نەیان دەزانی ئەو دەنگە ئی کێیەو ؟ بەڕاستی لە چیەوە دێ ؟ دوبارە بێ دەنگی باڵی ڕەشی بەسەر وەڵاتا ماڵیبەوە ، نە لەخیابان ، نە لە ناوباغدا دەنگی گیان لەبەرێك نەدەهات‌و کەس دیار نەبوو ، پووش بەهۆی باوە بەسەر دیوارەکاندا هەر فڕەی بوو • شەوبا توند بوو ، دیاربوو سەعات یەك‌و دوی نیوە شەوە ، (کەزیە) هەڵدە لەرزی ، لێی‌پرسی خەوت نایە ؟ گوتی : زۆرم سەرمایە • کۆتەکەی خۆی بۆ داکەندو بەشانانی هاداو گوتی : ئاوا گەرمت دەبێتەوە ؟

ـ بەڵێ : باوکە گیان •

## « مەتەڵەکە زیاد دەبێ »

(کەزیە) سەری وەبەردێك گردو خەوی لێ کەوت • ژانوالژان) بەدیاریەوە دانیشت ، هەر چەند گۆتەکەی خۆی بە (کەزیە) دادابوو ، بەڵام لەخۆشی (کەزیە) هەستی بەسەرما نە دەکرد • لەوکاتە ناسکەدا گوێی لەدەنگێك بوو وەك دەنگی زەنگوڵێکی چووك دەچوو ، دەیگوت : بەملی گایەکەوە لەناو لەوەڕگادا • هەستی پێ کرد کە یەکێك لەباغەکە دایەو وردە وردە بەناوباغەکەدا دەگەڕێ ، هەر دادێتەوەو ڕاست دەبێتەوە • دەیگوت : لەشتێك دەگەڕێ • (ژانوالژان) لەترسان لیوەلەرزەی هاتێ ، چونکە لەهەموشتێ سڵی دەکردەوە ، لە ڕوناکی خۆر دەترسا لە وەی ئاشکرایان بکا ، لە تاریکیشەو دەترسا دەیگوت : لەوانەیە غافڵ گیرمان کەن •

تا ئێستا لە چۆڵی ناوباغەکە دەترسا ، ئێستا لەزەلامی ناوباغەکە دەترسی • دەستی کرد بەسەرنج دانی کردەوەی سەیری کابرا ، کابرا لەناو بێستانی کاڵەکدا دەگەڕا ، بە جوڵانەوەی دەنگی زەنگوڵە دەهات ، بەنزیك بوونەوەی دەنگەکە زیاتر دەبوو ، دیارو ئاشکرابوو کە زەنگوڵەکە بەکابراوەیە ، بەڵام کێیە ؟ چ کەسە ؟ بۆ دەبێ وەك گاوو گوێرەکە زەنگوڵەی وەخۆ خستبێ ؟ کەس نازانێ •

لەکاتێکدا ئەو لەو خەیاڵانەدا بوو ، هات دەستی (کەزیە)ی گرت زۆر ساردو سڕ بوون ، گوتی : ئەی خوای گەورە فریام کەوە - (کەزیە)؟ (کەزیە) ؟ • (کەزیە) چاوی هەڵنە هێنان و وەڵامی نەدایەوەو وەخەبەر نەهات • (ژانوالژان) لەتاوانی دەستی کرد بەلەرزین و هەموو گیانی دەلەرزی ، دەیگوت : دەبێ (کەزیە) مردبێ ئاوا بێ حەرەکەو ئارامەو

جوڵە ناکا ؟ چوو گوێی بەهەناسەی داگرت لێی‌دەدا • بەڵام هەناسەی ئەوەندە زەعیف‌و لەسەرخۆ بوو دەتگوت : ئێستا نا ئێستا هەناسەی لێ دەبڕێ • لەتاوانی هیچی لەبیر نەما ، نەیدەزانی چۆنی گەرم بکاتەوە ؟ چۆنی هەستێنێ ؟ دەبوو تاچارەگە سەعاتێکی‌تر بی‌باتە شوێنێك گەرم دای‌بۆشێ •

## « کابرای زەنگوڵە دار »

(ژان‌واڵژان) ڕێوو ڕاست چوو بۆلای کابرای ناوباغەکە ، سەت فرانکی‌بەدەستەوە گرت‌و بەکابرای‌گوت : ئەگەر ئەوشۆ پەنامان بدەی ئەو سەت فرانکەت دەدەمێ ؟ ڕوناکی مانگەشەو لەناوچاوانی (ژان‌واڵژان) ی دابوو ، کابرا تەماشای کردو گوتی : ئەی ئەوە تۆی ؟ باوکە (مادلن) ؟ ژان‌واڵژان بۆ پاشەوە گەڕایەوە ، چونکەلەو کاتەدا چاوەڕوانی هەموو شتێکی دەکرد ئی ئەوە نەبێ کەلەو جێگایە بەو جۆرە بناسرێتەوە •

کابرا پیرە پشتی چەمی‌بۆوەو دەشەلی ، جل‌وبەرگی دێهاتیانی لەبەردا بوو ، پارچە چەرمێکی لەئەژنۆی خۆی دروبوو ، زەنگوڵێکی وێ هەڵاوەسی‌بوو ، لەبەر ئەوەی ڕوی لەسێبەر بوو دەبینرا ، بەڵام کابرا بەچاو پێکەوتن (ژان‌واڵژان)ی ناسیەوە ، زۆر بەرێزەوە بۆ ئیحتیرام کڵاوەکەی لەسەر سەر بەرزکردەوەو گوتی : ئەی بۆخاتری خوا باوکە (مادلن) ئەوە چۆن تەشریفت هات بۆ ئێرە ؟ چۆن هاتیە ژورەوە ؟ ئەوانە شێت‌بوون ئاگایان لەتۆ نەبوو ؟ ئەوە لەئاسمان هاتیەخوارەوە ؟ چیت‌لێ‌قەوماوە ؟ ئەگراوات لەملدایە ؟ نەکڵاوت

لەسەرە ؟ نە کۆتت لەبەردایە • خۆت والیٚ کردووە ، ئەوەی نەتناسیٚ لێت دەترسیٚ • (ژانوالژان) نەیویست درێژە بەقسە بدا گوتی : ئەی تۆکێیتو ئێرە کوێیە ؟

پیرە گوتی : من بەهۆی پیاوەتی تۆو سەدەقەسەری تۆوە هاتوومە ئێرە ، بۆ تۆ نامناسیەوە ؟ گوتی : نەخەیر لەیادم نیـــەو ناتناسمەوە • ئەی تۆ چۆن من دەناسیەوە ؟ پیرە گوتیی : ئاخر تۆ گیانیمنت کڕیەوە پیرە تۆزێك کشایەوە چۆ بەر ڕوناکی مانـگەشەوەکە ، ( ژانوالژان ) ئنجا ناسیەوە کە ئەوە (فوشلونت)ەو لەکاتی خۆیدا عەرەبانەکەی لەسەر لابردووەو لە مردن رزگاریکردووە • بەسەر سوڕمانەوە گوتی : ئای ئەوە تۆی ؟ ئێستا هاتەوەیادم • بەڕاستی زۆرم پێخۆشبوو تۆ بویت • پیرە گوتی : بەلێ تۆ سەرەڕای ئەوەش پارەی عەرەبانە شکاوەکـــەو ئەسپە تۆپیوەکەشت دامیٚو لەوباغەشدا دات مەزراندم • (ژانوالژان) گوتی : زۆرباشە ئەی بەو شەوە لەوباغەدا چدەکەی ؟ گوتی : ئـــەو کالەکانە وەژێر گلٚ دەدەم ، چونکە ئیمشەو سایقەیە ، ئەگـەر نەیان شارمەوە سەرما دەیان با • گوتی : ئەی باشە ئەو زەنگولە چیـــە ؟ گوتی : ئەوە بۆیە لەخۆم بەستووە تا ئەوانە لە منو تۆ دور کەونەوە • ووتی : کامـــانە ؟

( فوشلونت ) تەماشایەکی کردو گوتی : ئاخ ! لەوخانوەدا چـەند کچی جوان نەبیٚ ، لەمن بەولاوە پیاوی تێدانیە ، منیش وەك مەحرەمیان وام • ئەو زەنگولەم لەئەژنۆم بەستووە تا ئەگەر لێیان نزیکبوومـــەوە ڕوی خۆیان داپۆسن ، یان دور کەونەوە •

ـ باشـــە ئێرە کوێیە ؟

ـ خۆت باشتر دەزانی •

ـ نه خەیر من نازانم •

ـ ئاخر جەنابت بوو که منت بەباغەوانی لێرە دامەزراند •

ـ باشە ، بەڵام وەڵامم هەر بڕەوە •

ـ زۆرباشە ئێرە کلیسای (پتیپیکیوس• لەنکاو (ژانواڵژان) هەموو شتێکی هاتەوەیاد ، وەك لەگەڵ خۆی قسەبکا ، لەبەرخۆیەوە هەر دو پاتی دەکردەوەو دەیووت : کلیسای (پتیپیکیوس) !

(فوشلونت) گوتی : باشە باوکە (مادلن) پێت نەووتم : چـــۆن هاتیە ئێرە ؟ تۆوەك فریشتەی لێرە پەیدا بووی ، بەڵام چفائیـدە ئەگەر پێغەمبەریش بی ؟ چونکە کەس بێ نایێتە ئێرەوە ، من نەبێ کـەس نابێ لێرە بێ • (ژانواڵژان) گوتی : بەڵام من دەبێ لێرەبم • پیرە گوتی : ئاخ خوای گەورە • (ژانواڵژان) لە پیرە نزیكبۆوەو بەئەدەب گوتی : باوکە (فوشلونت)من گیانی تۆمنەجاتدا • ـ منیش لـەئەووەڵەوە وام وت :ـ زۆر باشە • ئێستا تۆ دەتوانی ئەو قەرزەم بدەیەوە • ـ منچیم لەدەستدێ ؟

ـ گوتی : لەپاشان پێت دەڵێم : • ئایا ژورێکت هەیە ؟ ـ لەپشتی کەلاوەی کلیساکەوە خانوێکم هەیە لەقوڕنەی باغەکـــەوە قـــەت نابیندرێ ، سێ ژورە • ـ زۆر باشە ئێستـا وەرە لەگـــەڵم تا ئـــەو منداڵەبەرین •(فوشلونت) بەسەر سوڕمانەوە گوتی : کەواتە منداڵێکیشت پێیە ؟ ئەو پیاوە قسەیتری نەکردو وەك سەگێك کەوەدوا خاوەنەکەی دەکەوی وەدوا (ژانواڵژان) کەوت •

لەپاش نیو سەعات دوبارە (کەزیە) کە لە جێگای باغەوانەکـەدا نووستبوو ڕەنـگیسور بۆوە • دوا نووستنی (کەزیە) هـەر دوکیـــان

لەبەر ئاگرەکە دانیشتن ، نانو پەنیریان خوارد ، لەبەر ئەوەی نوێنی تری لێ نەبوو لەسەر کۆمەڵە کا ڕۆکراوەکە ڕاکشان ، بەڵام هیچیان تا بەیانی لەبەر خەیاڵو بیر کردنەوە خەویان لێ نەکەوت .

(ژانوالژان) دەیزانی تازە ناسراوەو (ژاور) بە دوایدا دەگەڕێ ، ئەگەر لەشاردا بن زوو دەسگیر دەبن . بەلام ئەوکلیسایە شوێنێکی ئەمینە لەلایەکو لەلایەکی تریشەوە خەتەر ناکە ، چونکە هیچ پیاوێك حەقی نیە بچێتە وێو ئەگەر بیبینن بەجینایەتی لە قەڵەم دەدەنو دەی بەنەبەندیخانە . دەیگوت : ئەگەر بکرێ لێرە وەمێنین کەس نازانێو خەیاڵم زۆر ڕەحەت دەبێ ، بەڵام دەبێ ناوی خۆم بکەمەوە (مادلن) .

لەنیوەشەودا ئەو دوو پیاو و منداڵە چوونە بەر دەرگای خانوی ڕەقەم شەصتو دوو ، لەخیابانی (پتیپیکیوس) . لەبەر ئەوەی سەرپەرشتیکەری کلیسا کە ئافرەتێکی ڕاهیبەبوو ، کە چوونە ژوورەوە زۆر بەوردی تەماشای (ژانوالژان)ی کردو لەپاشان دەستی کرد بەپرسیار لێکردنو گوتی : تۆبرای باغەوانەکەی ئێمەی ؟

ـ بەڵێ : دایکی بەرێز .

ـ ناوت چیە ؟

ـ ( اولیموس فوشلونت ) .

ـ خەڵکی کوێی ؟ خەڵکی (پیکویکنی) . ـ تەمەنت چەندە ؟ پەنجاساڵ . ـ چ کارەی ؟ ـ باغەوان ـ بەڕاستی مەسیحی ؟ ـ خانەوادەی ئێمە هەمووی مەسیحیە . ـ ئەوە کچتە ؟ ـ بەڵێ دایکی بەرێز . ـ تۆباوکی ئەوی ؟ نەخەیر باپیرمی . ڕاهیبەی سەپەرشت ڕووی کردە ڕاهیبەیەك وتی : وەڵامەکانی جێی باوەڕن .

لەو ماوەدا باغەوانەکە دەنــگی نەدەکرد ، ڕاهیبەکە تەماشایەکی (کەزیە)ی کردو بەسەرپەرشتی کەرەکەی گوت : ( کەزیە ) ڕاهیبەیێکی باش دەبێ .

نەغمـــەو ئاوازەی بەیانی بـــەرز بۆوەو دەنــگی دەدایـــەوە لەهەموولایەکــــەوە ، (ژانوالژان) و (فوشلونت) بووژانەوە ، زۆری نەخایاند هەستان چوون لە سەر کۆمەڵە کایەك نوستن . ئێستا خەوی لێ نەکەوتبوو لەبەر خۆیـــەوە دەیکوت : ئێرە بۆ مـن زۆر جێگایەکی ئەمین و سەلامەتە . هەروەها لەمێشکی (فوشلونت) تیشدا ئەو خەیاڵاتا نە هاتوو چۆیان دەکرد ، تا لای بەیانی خەویان لێ نەکەوت !

هیچ گومان لەوە دانیەکە لەو شەوەدا هیچیان ئارامیان نەگرت . (ژانوالژان) هەر بیری لەو هـــەموو کارەساتەی خـۆی و ( کەزیە )و (ژاور) دەکردەوە و ، نیازی وابوو تا بۆی بلوێ لەو جێگا ئەمینــــە وەمێنی ، بەڵام (فوشلونت) بیرکردنەوە ماندوی کردبوو ، بەتایبـــەتی دەیگوت : دەبێ (مادلن) چۆن هاتبێتە ئێرە ؟ چۆن بەســـەر ئەو دیوارو شورەدا سەرکەو تبێ ؟ ئەوکچە چیـــە ؟ لەکوێوە هاتبێ ؟ ئـــەو ئـــەو بەسەرهات و کارەساتەی (مادلن)ی نەبیستبوو . دوو ڕاهیبەکە پێـکەوە هێندێکیان سرکـــە کردو گەورەکەیان ڕوی کردە باغەوان و گوتی : زەنگوڵێکی دی پەیدا بکە . ڕۆژی دوایی دەنگی دوو زەنگوڵە لەناوباغەکە دەهات . ڕاهیبەکان بەسەرسامیەوە چارشێویان لەسەرڕوو لاداو تەماشایان کرد دوو کەس شان بەشانی یەکتر لەناوباغەداو کار دەکەن ، یەکیان ئەوەی جارانە ، بەڵام ئەوی تریان ناناسن ! بەگوێی یەکتریاندا دەسرکـــانە ، دەیانگوت : ئەوەش باغەوانە ؟ (کەزیە)شیان بەئەندامی کلیسا وەرگرت و بردیان بۆ نوێژگە تا یاسای ئەوان فێربێ و بێتە ڕاهیبە . ( کەزیە ) بە

کلیسادا دەنگی نەدەکرد ، ئـەو وای دەزانی کچی (ژانوالژان)ە •
وەکو ووتمان : هیچ شتێك وەك فەقیریو بەدبەختی سەر بەمندال شۆڕ
ناکەن • (کەزیە)ش ئەوەندەی ڕەنج بردبوو کـە لەهەموو شتێك ،
تەنانەت لەقسە کردنیش دەترسا • (کەزیە) ببوو بەقوتابی کلیسـا •
کراسی تایبـەتی قوتابیانی زانیاری دینی لەبەردا بوو ، ( ژانوالژان )
کراسە ڕەشەکەی کـە بۆ تازیە باری دایـکی بۆی کڕیبوو ، بۆی
هەلـگرتبوو • کلیسا بۆ ( ژانوالژان ) ببو بەجەزیرەیێکی پـانو پڕ
ئاوو ، ناو ئـەو چوار دیوارەی بۆ ببوو بە ئیقامەتـگا • لەناو ئەو باغو
کلیسایەدا بەشیخۆی ئاسمان چاو پێدەکەوت • لە (کەزیە)ش نزیك‌بوو
بۆ دڵ پێخۆش‌کردن • ژیانێکی زۆر خۆشیان لەکلیسادا دەست پێ کرد •

( ژانوالژان ) هـەموو ڕۆژێ کـاری دەکردو خزمەتی زۆری
ئەنجامدا • ئەو زوو گوڵ هەلگرەوەو قەڵەم لێدەرو نەمام ڕاهێنەر بوو ،
ئیشی باغەوانی باش دەزانی ، باغـەکەی باش ڕازاندبۆوە ، زوربەی
دارەکانی لێك پەیوەند کردبوون ، نەمامی تازەی پێگەیاندبوو ، میـوەی
زۆرو باشیان دەگرت • (کەزیە) مافی ئەوەی هەبوو رۆژی سەعاتێك
بچی بۆلای بابەگەورەی • هەموو ڕۆژێك لەکاتی دیاری‌کراودا دەچۆ
خانووی باغەوانەکە • ئەو خانو باغە لەبەر چاوی ( ژانوالژان ) وەك
قەسرو باغی بەهەشتێ لێ هاتبوو •

کۆمەڵێك ئافرەت تەرکی دنیایان کردبوو بۆخزمەتی دین لـەو
کلیسایەدا بوون • (ژانوالژان)یان بەبرای باغەوان دەزانی و (کەزیە)
شیان بە نەوەی (ژانوالژان)دا دەنا • زۆر سەیرە ؟ بەسەرهات ڕێـگای
خـۆی دەبڕیو ئـەوەی کەقـەشەو واعیزی شاری ( دینێ ) بۆ
(ژانوالژان)ی ئارەزو کردبوو ڕوویدابوو ، دەستی قەزاو قـەدەر

ڕایان کێشا بۆ خزمەتی دین •

هەموو شتێك ، ئەوباغە ئارامە ، ئەو گوڵە جوانانە ، ئەو منداڵانە ، کە تەرکی دنیایان کردووە ، ئەوخوشکە ڕاهیبە بەرێزانە ، ئەو پێکەنین‌و شادی‌یە خۆشە ، ئەو کچەسادانە ، ئەو نوێژگە بێ‌دەنگ وئارامـــە ، هەموویان دەستی یەکتریان گرتبوو وردە وردە دەچوونە ناو ڕوحـــی (ژان‌والژان)ەوە • ڕوحی وەك ئەو نوێژگە ئارام‌و ، وەك ئەو گوڵانــە گەش‌و ، وەك ئەو باغە خاوەن بەرووە ، وەك ئەو ڕاهیبانە پاك‌و ، وەك ئەو منداڵانە ســاف‌و بێ‌گـــەرد ببوو ، دڵی پڕ بوو لەئومێدو عیشق‌و خۆشەویستی • ساڵەها بەو جۆرە تێپەڕین و ڕۆیشتن‌و (کەزیە) گەورە بوو ، لەگـــەڵ ئـــەو خوشـکە ڕاهیبانە و لەناو ئەو کۆمەڵەپاك داوێنـــانەدا !

لەپاش تێپەڕبوونی هـــەشت ، نۆ ساڵ بەسەر کارەساتی بەشی دووەم لەو چیرۆکە ، لەخیابانی (تەسبەل)دا کوڕێك دەبینرا لەتەمــەنی یازدە ساڵیدا دەم بەپێکەنین‌و ڕۆخۆش ، دەربێ‌یێکی نشی لەپــیدا بوو ، باوکی بۆی نەکڕی‌بوو ، کراسێکی ژنانەی لەبەردا بوو ئی‌دایکی نەبوو، بەڵــکو خێریان پێ کرد بوو • هەرچەند دایك‌و باوکی هەبوو ، بەڵام بەخەیاڵیشیاندا نەدەهات • لەو منداڵانە بوو کەشیاوی خۆشەویستین ، چونــکە باوك‌و دایــکی هەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا دەتگوت : هــەتیوەو دایك‌و بابی نیە ! ئەوکاتەی خۆش‌بوو کە لەسەر شۆستەی جادەکــان بێ ، چونـــکە بۆوی لـــەدڵی دایــکی نەرم‌تر بوو • یاری دەکردو پێدەکەنی ، دڵی ئاســـودە بوو ، هەرچـــەند دایك‌و باوك‌و جێـــگاو ڕێــگایەکی نەبوو • بیری لەبەیانی نەدەکردەوە ، وەك خەڵك دەژیا ، لە پردەکە دەپەڕیەوە دەچۆ خانووی ڕەقەم ٥٠ ، ٥٢ دوو کە مــەنزڵی

(ژان‌واڵژان)و (کەزیە)بوو ماوەیەك و کە (ژاور) زانی چۆڵیان کرد •

لــــە دوا ئەوان عائیلێــــکی فەقیر کەژن‌و پیاوێك و دوکچ بوون چووبوونە ناوی ، کابرا ناوی (ژوندریت) بوو • ئا ئەو عائیلە عائیلەی ئەو کورە بێ نەوایە بوو • قــەت ڕوی‌خۆشی لێ‌نەدەدین • ئــەو کورە دەتــگوت : گیایە لەئێنجــانەدا بێ کــەس‌و بێ‌دەر پەروەردەبووە ، تەیدەزانی باوك‌چۆنەو دایك چیــە • ئـەو کوڕە ناوی ( غـافرۆشی ) بچووك بوو •

لە ژورێــکی نزیك مەنزڵی ئەوعائیلەدا کورێــکی گەنج دەژیا ، ئەویش لەوان تێرتر نەبوو • ئەو کوڕە ناوی (ماریوس)بوو • جا بزانە کە (ماریوس) کێیە ؟

## « دەرەبەگی گەورە »

لەگــــەرەکی (بەشارات)و (نورماندی)و (سین‌تونز)دا ، ئێستاش پیاوی پیری وا ماون کــــە (ژیل‌نورماند)ی پیریان لەبەر چــاوەو باسی دەکەن • (ژیل‌نورماند) لەساڵی (١٨٣١)دا لەو کەسانە لەقەڵەم دەدرا کە بەهۆی تەمەنی درێژەوە زۆر دڵ ساف‌و سادەن • ئەو جۆرە کەســـانە زۆر غەریبن ، چونــکە زوو وەك خەڵك‌بوون و ئێستا وەك خەڵك‌نین ، بەتایبەتی ئەو پیاوە زۆر عەجایب بوو ، مرۆڤێکی سەرمایەداری قەڕنی هەژدە بوو ، تەمەنی پێی نابۆ نەوەت ساڵ زیاترەوە ، دەنــــگی باش دەهات ، چــــاوی بۆتەماشای کتێب نەبێ پێویستی بەچاویلکە نەبوو ، بەئارەزوی خۆی دەی خواردو دەی‌خواردەوە ، دوکچی بوو ، یەکیان تەمەنی پەنجا ساڵ بوو شوی نەکرد بوو ، کەتوڕە دەبوو ، ئــــەو کچە

گەورەی دارکاری دەکرد ، دەتگوت : کچی هەشت ساڵەیە ، وای ڕەفتار لەگەڵ دەکرد • بەینی تەمەنی ئەو دوو کچانە دە ساڵ بوو ، لەگەنجیدا کەمێك وەکێك دەچوون ، لەڕەوشتدا وەك‌یەك بوون • بچوکە کەیان ڕوحێکی زیندوی بوو ، ڕوی دەکردە شوێن‌و جێگای خۆش ، لەگەڵ گوڵاندا ڕازو نیازی دەکرد ، عەلاقەی لەگەڵ شیعرو مۆسیقادا زۆربوو ، خوشکی گەورە لەعالەمی خەیاڵ‌و خەوندا ، بە مێردێکی دەوڵەمەندی خاوەن حەسەب‌و نەسەب دەگەڕا •

هەر دوکیان باڵدار بوون ، بەڵام یەکیان وەك فریشتەو ئەوی دی وەك مراوی • بچووکە کەیان بە ئارەزوی خۆی مێردی‌کرد ، بەڵام تەمەنی درێژ نەبوو ، مردو کوڕێکی لەپاش بەجێما ، گەورەکەشیان بە کچی مایەوە • کاتێ ئەو کچە لەداستانەکەی مەدا دەور دەبینێ پیر دەبێ • ئەو کچە زۆر شەرمێون بوو ، مروری ڕۆژگارو تەمەن درێژی شەرمەکەیان زیاتر کردبوو • زۆر بەدین‌بوو ، زۆر دەچوو بۆ کلیساو دوعای دەکردو هەموو کاروباری ماڵی باوکیشی دەکرد ، کوڕی خوشکەکەشی بەخێو دەکرد •

## « بابە گەورە و نەوە »

لەوکاتەدا هەر کەسێ بەشارە بچکۆلەکەی ( ورنون ) تێپەڕیباو بە سەر ئەوپردە جوانەدا بڕۆیشتایەو تەماشا خوارەوەی بکردایە ، پیاوێکی پەنجا ساڵەی دەدی • کەکڵاوێکی گەرگەڕی چەرمی لەسەربوو • پێڵاوی داری لەپێدا بوو • لیباسێکی خۆڵەمێشی لەبەردابوو بینەی سوری لێدابوو ، ناوچاوانی بە (تاو) ڕەش‌بوو سوتابوو ، تووکی

سەرو ڕیشی سپی‌بوو ، برینێکی بەناو چاوانەوە بوو تا سەر ڕومەتی هاتبۆ خوارەوە ، وەك پەڵێکی سپی دەچوو ، تۆزێك کۆمابۆوە ، لەتەمەنی خۆی پیرتر دیار بوو ، هەموو رۆژێك بێڵێك‌و چەقۆیەکی تیژی بەدەستەوە دەگرت‌و لەقەراغی لای چەپی چۆمی (سین)دا خەریکی کاری باغەوانی دەبوو • لەلای چەپی چۆمەکەوە حەسارو حەوشەی زۆر بوون ، پڕبوون لەگوڵ‌و گیای بۆن‌خۆش ، لایەکیان چۆمەکەبوو، لایەکەی‌تریان خانووبەرە بوو • ئەو پیاوەی باسمان‌کرد لەسالی (١٨١٧)دا خانوێکی بچوك‌و باغێکی ئیجارەکرد بوو زۆر دەست‌کورت بوو ، لەوێدا ژیانی دەبردە سەر • ئافرەتێکیش لەوێ دەژیا نە گەنج بوو ؟ نە پیر ، نە جوان‌بوو ، نە ناشیرین ، نە ڕەعیەت‌بوو ، نە سەرمایەدار • ئەو پیاوە چونکە شوغلی باغەوانی بوو گوڵی جوانی پەروەر دە دەکرد ، خەڵك زۆریان باس دەکرد •

هەر کەس لەوزەمانەدا بەسەرهاتی سەربازانی لشکری گەورەی لە گۆڤاروو رۆژ نامەی (موتی‌نوز)دا وەخوێندایەو چاوی بەناوی (ژوژپونت‌مرسی) بکەوتایە کە بە زۆری لەواندا دەنووسرا ، سەرسام دەبوو • ئەو پیاوە لەکاتی لاویدا لە رژیمی (ستین‌تونژ)دا سەرباز بووە ، تا شۆرش پەرەی ستاندو لەدوا دامرکاندنەوەی شورش تەقاعوود کراو ئێستا بەپارەی ئەو تەقاعودیە دەژی • ئەو پیاوە لەپاش دوو سال کچە چووکەکەی ( ژیل‌نورماند )ی مارە کردو منداڵێکی‌لێ بوو دایکەکەی مرد •

باوکی ئافرەتەکە گوتی : نەوەکەم بدەنەوە ، خۆم بەخێوی دەکەم • باوکی کوڕەکە بەناچاری بەڵێنیدا ، چونکە باپیری کوڕەکە گوتبووی • ئەگەر لای‌خۆم نەبێ لەمیرات بێ‌بەشی دەکەم : (پونت‌مرسی)

کوڕەکـــەی بۆنار دەوە (ژیل‌نورماند) تەمـــەنی نەوەت ساڵبوو ، (پونت‌مرسی) خۆش نەدەویست ، چونـــکە ئەو سەڵتەنەت تەڵەب‌بوو ، (پونت‌مرسی) جمهوری خوازبوو ، لەگەڵ (ناپلئون) خزمەتی کردبوو . پێی‌خـــۆش نەبوو کوڕەکەی لای‌باپیـــری‌بێ . ئـــەو کوڕە ناوی (ماریوس)بوو ، هەر ئەوەندەی دەزانی باوکێکی‌هەیەو هیچی‌تر . بەرە بەرە کوڕە گەورە بوو ، لەقسەی ئـــەمو ئەوەوە بۆی دەرکـــەوت کەباوکی خەیانەتی بەفەرماندەی خۆی‌کردووە و تەنانەت لەکـــاتی لاویشیدا خەیانەتی بەوەتەنیش کردووە ، لەوەوە لای نەنگ‌بوو کـــە باوکێکی‌وای هەیە زۆری پێ‌ناخۆش بوو .

پووری کەخوشکی گەورەی دایکی‌بوو ، جـار جـار دەی‌برد بۆ کلیسا زۆری‌خۆش دەویست ، چونکە خوشکەزای بوو .

باوکی (ماریوس) بەچەند مانگ جارێك دەچۆ (پاریس)و بەدزی دەچۆ (کلیسا)و بەلەرزینەوە لەپشتی کۆڵەکەیەکدا خۆی دەشاردەوەو بە ئارەزوی خۆی تەماشا (ماریوس)ی دەکرد ، لەوەوە بوو کەلەگـەڵ باوکە (مابوف) دابوو بە ئاشنا .

چەندساڵ تێپەڕین . (ماریوس) هەر لەلای باوکە گەورەی بوو . هەروەك وتمان : هەر ئەوەندەی دەزانی کە باوکێکی هەیە ، باغەوانەو لەشاری (ورنون)دا ژیان دەباتەسەر . ساڵی دوو جار لە دێکەی‌پووری‌ڕا نامەی بۆباوکی دەنارد ، بەڵام لەبەر ئەوەی وەڵامەکە دەکـەوتە دەست باپیری بەوی نیشان نەدەدا .

# « كۆتایی چاوه ڕوانی »

خوێندنی ( ماریوس ) بەچـاو دێری بابەگەورەی بەرەو تەوابوون دەچوو ، لە ساڵی ( ١٨٢٧ )دا ، تازە تەمەنی پێی نابۆ هەژدەساڵیـەوە ئێوارەیەك هاتەوە مـــاڵ ، باپیری نامەیێـــکی دایـە دەستو گوتی : (ماریوس) بەیانی زوو بچۆ بۆشاری (ورنون) • گوتی : باوکـە بۆچی بچم ؟ ـ بۆ چاو پێ کەوتنی باوکت • (ماریوس) موچڕکێکی پێداهات ، چونکە بیری لە هەموو شتێك دەکردە وە لەوە نەبێ کەرۆژێك بێ ، چاوی بەباوکی بکەوێ ، لای زۆر عەجایب بوو • ئەو وایدەزانی کـــەئەو باوکـەی کەزەمانێك پیـــاو کوژبووە ئەمی خۆش ناوێ ، چونـــکە ئەگەرخۆشی بویستایە بەخێوی دەکرد • بەوهۆیەشەوە کەقـەت باوکی نەدی بوو نیشانەی خۆشەویستی پێوە دیار نەبوو • بەو هەواڵە ئەوەندە پەشۆکا ، وەڵامی بۆ نەدرایەوە • باپیری درێژەی پێداو گوتی : باوکت نەخۆشە داوای تۆی کردووە ، دەبێ بەیانی زوو بڕۆی • ســـەعات شەش عەرەبانەی جووت ئەسپی دەڕوا بۆ شاری (ورنون)و شــــەو دەگاتەوێ ، تۆ بەسواری ئەوبڕۆ ، باوکت چاوەڕوانە • باپیری لەپاش ئەوقسانە کاغەزەکـــەی لێوەرگرتەوەو دەباخەڵی نایەوە • ئەگـــەر (ماریوس) ئەوشەوە بڕۆیشتایە ؟ فریا باوکی دەکەوت ، بەڵام باپیـری گوتی : دەبێ بەیانی بچی • خولاسە عەسری ڕۆژی دوایی (ماریوس) گەیشتە شاری (ورنون) • چراکانی ناو شار تازە هەڵدەکران • تووشی پیاوێك بوو لەماڵی (مونتمرسی) پرسیاری لێ کرد • کـــابرا چـوو نیشانیدا • چوو لە دەرگای دا ئافرەتێك هـــات دەرگـــای کردەوە ، (ماریوس) لە (پونتمرسی) پرسی ئافرەتەکە لەشوێنی خۆی بێ دەنگ ڕاوەستا قسەی نەکرد • (ماریوس) گوتی : ئێرە ماڵی (پونتمرسی)یە ؟

ـ سەرێـكى بەلاوەنا ، يەعنى ـ نەخەير ٠ (ماريوس) بە پەشۆكاوىيەوە گوتى : ئاخر من كوڕى ئەومو چاوەڕوانيم دەكا ٠ ئافرەتەكە گوتى : تازە چاوەڕوانيت ناكا ٠ لەوكاتەدا چاوى لەئافرەتەكەوەبوو فرمێسـكى بەڕومەتاندا دەهاتنەخوارەوە ٠ ئافرەتەكە بەسەر ئيشارەى بۆكرد چۆ ژوورەوە ٠ كەچوو سێ كەس لەژوورەكەدا بوون ٠ يەكيان ڕاوەستابوو يەكيان بەچۆكدا هاتبوو ، يەكيـان بەڕوتى لەسەر عەرز ڕاكشا بوو ، ئەوەى ڕاكشابوو ، سەربازى پير باوكى (ماريوس) بوو ٠ دووەكانى ترە يەكيان دوكتۆرو ئەوىتريان قەشە بوو ٠ (پونتمرسى) سێ رۆژ بوو تووشى نەزيفى دەماغ ببوو ، هەر كـەناڕەحەت ببوو ، نامەيێـكى بۆ خەزورى نووسىبوو (ماريوس)ى كوڕى بۆ بنێرێتەوە ، ڕۆژى دوايى وەزعى بەرەو خەرابى ڕۆىبوو ، لە شەوى هاتنى (ماريوس)دا تووشى قسە بزرڕكاندن‌ببوو ٠ هەستابوو دەستىكردبوو بەهـاوار هـاوارى ـ كوڕەكەم ـ كوڕەكەم نەهات ؟ دەبێ خۆم بچم بۆلاى ٠ لەژور هاتە دەرەوەو لە ڕێڕەوەكـە بەلاداهاتو مرد ٠ دوكتۆرو قەشەيان بانگ كردن ، بەڵام دوكتۆر بڕێك درەنگ هاتبوو ٠ (ماريوس) كە يەكەمجارو ئاخرجـاربوو ئەوپياوە ببينى ، بەو سەرو سيما مـەردانەيەوە ، بـەو چاوەگەشانەوە كەئيتر هيچيان پێنابينێ ، بەو مووە سپيانەوە ، بەو سەرو سينگەوە كە پڕ بوو لە شوێنى شيرو گوللە ، بـەو برينە كـەتەواوى ڕومەتى داگرتبوو ، زانى كـەئەوە باوكيەتى مردووە ٠ لەوێ ڕەق ڕاوەستا ، لەهەمان كاتيشدا هەستى بەبێكەسىو بەژارەيى دەكـرد ، دەستىكرد بەلۆمە كردنى خۆى ، بەڵام ئايا تاوانى ئەو بوو ؟ لەڕاستىدا باوكيى خۆش نەدەويست ٠

سەربازى پير هيچى لەپاش بەجێ نەمابوو ، كـەلو پەلەكەى

بەحاڵو باڵ بەشی هەقی کفن‌و دفنی کرد • خزمەتکارەکە پارچــــە کاغەزێـکی هێناو دای بە (ماریوس) • بەخەتی‌باوکی نووسرابوو – بۆ کوڕی خۆم لەشەڕی (واترلو)ەوە من لەلایەن ئیمپراتۆرەوە ناز ناوی (بارون)م دراوەتێ ، ئێستاش ئەو ناز ناوە دەبەخشم بەکوڕەکەم ، چونکە ناز ناوێـکە بەخۆێنی خۆم وەدەستم هێناوە • حەوجێ بە گوتنیش نیــە بڵێم : چونـکە کوڕەکەم شایانی ئەو ناز ناوەیە ، لەهەمان شــــەڕی (واترلو)دا ســەر پەڵێك بەناوی (تـاردیە) منی لەمردن رزگـارکرد ، دەڵێن : لەو دوایانەدا لەشاری (مونت‌فرمیل) قاوەخانەی داناوە ، ئەگــەر کوڕەکەم ئەو پیاوەی دی هەر خزمەتێکی لە دەست‌هات پێی بـکا •

(ماریوس) نەك لەبەر ئەوەی واجبی سەرشانی لەبەرامبەر باوکیدا ئەنجام بدا ؟ بەڵـکو بەهۆی ئەو ئیحتیڕامەوە کـــە لـــە دڵی هەموو ئینسانێکدا بەرامبەر بەمردوو پەیدا دەبێ نامەکـــەی نوشتاندەوەو دەیا خەڵێی نا • (ماریوس) هەر چل‌و هەشت سەعات لەشاری (ورنون)مایەوە لەپاش کفن‌و دفنی باوکی گەڕایەوە بۆ (پاریس) • تەنانەت یادی باوکی لە خەیاڵیشدا نەمـــا •

سەربازی بێ‌نەوا لەماوەی دوو رۆژدا کفن‌و دفن کراو لەسەری سێ رۆژەدا لەبیرچۆوە • (ماریوس) بۆ تازیەکەی تەنیا هەر فەیتانێـکی رەشی لە کڵاوەکەیدابوو هیچی‌تر •

## « چۆن ئینسان دەبێتە شۆڕشگێر »

(ماریوس) عادەتی دینی خۆی تەرك نەکردبوو ، هــەموو رۆژی یەك شەممە دەچۆ کلیساو دوعای دەخوێندن • ئەو کلیسایەی کە لە گەڵ

بووری بە منداڵی دەچوونە وێ •

ئەو ڕۆژە یەکشەممە بوو ، هەستا چوو بۆ کلیساو لەبەرامبەر میحرابەکە لەسەر سەکۆیەک بە چۆکدا هات ، بەڵام پیرە مەردێک هاتو گوتی : ئاغا ئەوە جێگای منە • (ماریوس) بێدەنگ هەستاو چوو لەولا بەچۆک داهات • دوا دوعا خۆیندن بەدەریای بیرکردنەوەدا چـــو خوارێ • کابرا پیرە هات گوتی : ئاغا داوای لێ بوردنت لێ دەکـــەم کەدڵی تۆم هێشاندو ئێستاش هاتووم کاتت‌دەگرم ؟ دیارە لەوانەیە تۆ من بەمرۆڤێکی خودپەسند بزانی ، بەڵام باخۆمت پێ‌بناسێنم • (مـاریوس) سەری ڕاوەشاندو گوتی : ئاغا پیویست ناکا • پیرە گوتی : ئاخـر نام هەوێ گومانی خەراپم لێ بکەی ؟ بزانە من زۆر موبالات بەو شوێنـــە دەکەم ، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە داوام لەتۆ کرد جێگاکەت بگۆڕی ، من لامۆایە لەسەر ئەو سەکۆیە دوعا باشتر گیرا دەبێ ، ماوەی دەسـاڵ ئاگاداری بەسەرهاتو کارەساتی ئەو سەکۆیە بووم • هەر بەدوو سێ مانگ جارێک پیاوێکی هەژاری ئازا ، کە لە کوڕەکەی دوور کەوتبۆوەو لەبەر ئەوەی ناکۆکی لەگەڵ ماڵی خەزووریدا بوو نەی دەتوانی ببینی ، دەهاتە ئەو کلیسایە ، دەهـات لەپشت ئەو کۆڵەکـــە دادەنیشتو تێر دەکوڕەکەی دەفـکریو دەگریا • ئـەو پیاوە بەدبەختـــە کوڕەکەی دەپەرست هەموو یەکشەممان لەو جێگایە لەگەڵی دەدوامو بووینە ئاشنا• من دەرکەوانی کلیسا بووم ، تەواوی بەسەرهاتی خۆی بۆگێڕاومەوە ، دەیگوت : هەر خەزوورێکو ژن خوشکێکم هەیەو ژنەکەم لەسەر منداڵ مردووە و کوڕەکـــەم لەلای ئـــەوانە ، لەبەر ئەوەی کوڕەکـــەی خۆش‌بەخستو دەوڵەمەند بێ ڕازی بوو لای ئەوان بێ •

ئەو خەزوورەی لەسەر مەسائیلی سیاسی لەگەڵی نارێک بوو ، بەڵام

باشە ئەو فەقیرە چ گوناحێکی کردبوو ؟ لەبەر ئەوەی حەزورەکەی ناخۆشی دەویست ، چونکە لەشەڕی (واترلو)دا بەشداری کردبوو ، بەکێک‌بوو لەئەفسەرەکانی (ناپلئون) . بەهەرحاڵ . وادیارە ئەوباوکە بێچارە مردووە ، ئاخر ئەو لە شاری (ورنون)دا دەژیا کەباوکم قەشەی ئەوێ بوو ، گویا ئەو بەدبەختە ناوی (پونت‌مرسی) بووەو برینێکی درێژی بەڕومەتەوە بوو لەکاتی خوێندا شیریان لێ دابوو . (ماریوس) گوێی بۆ شل‌کردبوو ، ڕەنگی بەڕی‌بوو گوتی : بەڵێ ناوی (پونت‌مرسی) بوو ، کابرا گوتی : جاتۆ چوزانی ؟ گوتی : ئاخر ئەوپیاوە باوکی من‌بوو . دەرکەوانی پیر دەستی دەبەر یەك نان‌و بەپەشۆکاویەوە گوتی : ئاخ کەواتە تۆهەوی ؟ دەبوو هەر زوو بمزانیایە کە ئەو کوڕەگەورە بووە . گوتی : بەڕاستی باوکت تۆی دەپەرست .

(ماریوس) دوعا خوازی کردو هاتەوە ماڵەوە . ڕۆژی دوایی بە باپیری گوت : هاواڵەکانم خۆیان ئامادە کردووە بچن بۆ ڕاو ، ئیجازەم دەدەی سێ ڕۆژ لەگەڵیان بچم ؟ - گوتی : کەیفت لێیە چوار ڕۆژ مەیێوە ؟ باپیری لە پاشان ڕوی کردە کچەگەورەکەی گوتی : بەسەرهاتێکی عاشقی .

(ماریوس) ماوەی سێ ڕۆژ لەماڵ دور کەوتەوە هێندێکی لەبەسەرهاتی بابی بۆ ڕون‌بووە ، لەپاش سێ‌ڕۆژ هاتەوە ( پاریس )و یەکسەرە چوٚ کتێبخانەی دانشگای حقوق‌و داوای ڕۆژنامەی (مونی‌تور)ی کردو دەستی‌کرد بەخوێندنەوەی مێژووی شۆڕش‌و بۆیەکەم جار ناوی باوکی دۆزیەوە ، بەتایبەتی کەمەقالە مێژوییەکانی سەبارەت بەجمهوری‌و یاد داشتەکانی (سنت‌هلن)و (زورلها)و (بولتن)و (ناپلئون)ی خوێندنەوە ، زیاتر بەی بەئازایی‌و فیداکاری باوکی بردو

خۆشەویستی باوکی لەدڵ چەقی • وەك کلیلێکی بدەنێ هەموو دەرگای بۆکرانەوەو زانی کە دووری لەچی دەکاو ڕێزی چیدەگری ، هەموو شتێکی بۆ ڕون بۆوە ، زانی کەفێرکراوە کام پیاوی گەورەو کـــام کردەوە چاکەی ناخۆش بۆی • زانی کە لە جێگای ئەو ڕقو نەفرینە دەبێ تۆوی چ عیشقو چ خۆشەویستییەك بچێنێ ؟

کـــاتێ بیری لەو بیرو باوەڕە گەندەڵـە کردەوە ، کە تا دوێنێ لەمێشکیدا بوو ، لۆمەی خۆی کردوو زەردە خەندێکی هاتێ • کـــە بڵێسەو شوعلەی ئازادیو شۆڕش لەدەرونیـــدا زمانی کێشا ، لـــە کتێبخانەوە چوو بۆ چاپخانەو سەت کـــارتی بەناوی (بارون ماریوس پونتمرسی) لەچاپدا • کە جار جار لەماڵ غایب دەبوو پورە پیرەکـەی ناڕەحەت دەبوو دەیگوت : دەبێ بۆ کوێ چووبێ ؟ جارێك چـــوو بۆ شاری ( مونتفرمیل )تا وەسیەتەکەی باوکی سەبارەت بە (تناردیە) جێ بەجێ بـــکا • دەستی کرد بە پرسیار لەخەڵك تا (تناردیە)ی پێ بڵێن : بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوەی بداتەوە کە لە شەڕدا باوکی لەمەرگ ڕزگار کردووە ، بەڵام (تناردیە) شکستی خواردبوو ، کەس نەی دەزانی ڕوی لەکۆی کردووە،لەو سەفەرەدا چوار ڕۆژی پێ چوو پوورو باپیـــری زۆر ناڕەحەت بوون ، ئەوان دەیانگوت : (ماریوس) شتێکی بەقەیتانێکی ڕەشەوە لەملی خۆی کردووە لەبن کراسەکەیدا هاتۆتە ســـەر سینگی ، نازانین چیە ؟ لەباسەکـــانی پێشوودا باسی ئەفسەرێکمان کـرد کـــە خوشکەزای (ژیل نورماند)بوو • ئەو کوڕە گەنجە لەسپادا خزمـــەتی دەکردو دوور لەدارو دیاری خۆی دەژیاو ناوی (تێودول) بوو • ئەوەی پێویستی ئەفسەرێکی شایستەبایە تێیدا بەدی دەکرا • زۆر کـەم دەچۆ (پاریس) و (ماریوس) قەتی نەدی بوو • پووری ئـــەو خوشـــکەزا

باوکی‌یه‌ی زۆر خۆش ده‌ویست • به‌یانیه‌ك تازه له گه‌سك‌دان بۆوه‌و ماندوو بوو پاڵی به‌کورسی‌یه‌که‌وه دابوو ، زۆریش تێ‌نه په‌ڕی‌بوو که (ماریوس)بۆ قوڵه سه‌فه‌رێك ڕوخسه‌تی له‌باپیری وه‌رگر تبوو ئیجازه‌ی دابوو ، به‌ڵام گوتبووی : ئاخری ئه‌و کوڕه ده‌بێته هۆی ده‌ردی سه‌ری بۆ ئێمه •

له‌پاشان ئافره‌ته‌که بۆ کات به‌سه‌ر بردن چۆ ژوورو ده‌ستی‌کرد به‌گوڵ چنین‌و نه‌خشکردن ، دوای چه‌ند سه‌عات له‌نکاوێك ده‌رگاکرایه‌وه ، که سه‌ری هه‌ڵبڕی چاوی به‌کوڕه پووره‌که‌ی که‌وت هات ، سه‌لامێکی گه‌رمی لێ‌کرد • له خۆشیان هاواری کردو گوتی ・ ئه‌ی ئه‌وه تۆی ؟ (تئودول) ؟ گوتی : به‌ڵێ ئامۆزاگیان • چاك‌و چۆنیان کردو پێی‌گوت : حه‌تمی حه‌فته‌یه‌کمان لا ده‌بی ؟ ووتی : به داخه‌وه بۆم ناکرێ ، ده‌بێ ئه‌وشه‌و بگه‌ڕێمه‌وه • ئامۆزای هه‌ناسێکی هه‌ڵکێشاو گوتی : چۆن ده‌بێ ؟ نابێ بڕۆی ؟ (تئودول) گوتی : ناکرێ هه‌ر ده‌بێ بڕۆم ، به‌دڵ پێم خۆشه ، به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی پادگانه‌که‌مان له (ملون)ه‌وه نه‌قڵ‌بووه بۆ (گیلوان) ڕێگام که‌وته (پاریس)و به‌فرسه‌تم زانی لامدا بۆ لاتان •

پووری پرسیاری کردگوتی : به‌سواری ئه‌سپ ده‌چیه‌وه ؟ له‌وه‌ڵامدا ووتی : له‌به‌ر ئه‌وه‌ی چاوم به‌ئێوه بکه‌وێ ئیجازه‌م وه‌رگرت‌و ئه‌سپه‌که‌م به‌به‌رده‌سته‌که‌مدا به‌ڕێ کرده‌وه‌و خۆم به‌سواری گاری‌یه ده‌چمه پادگان • گوتی : ئه‌رێ ئامۆزا ئه‌وه (ماریوس)ی ئامۆزاشم بۆسه‌فه‌ر ده‌چی ؟ له‌وه‌ڵامدا ووتی : بۆوادەڵێی ؟ چوزانی ده‌چێ بۆسه‌فه‌ر ؟ ووتی : ئاخر کاتێ گه‌یشتمه (پاریس) چووم جێگا بگرم ، کوڕێك جێگای گرتبوو ، ناوی خۆی نووسی بوو ، ناوی ( ماریوس

پونتمرسی)بوو • ئافرەتەکە هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی : ئەی کوڕی ئەحمەق ، شەو لەگاریەدا دەبێو دەچێتە سەفەر ؟ (تئودول) گوتی : چاچیە ، ئەویش وەك من ؟ گوتی : وانیە ؟ سەفەری تۆ بەهۆی وەزیفەوەیە • بەڵام سەفەری ئەو بێهودەیە • (تئودول) گوتی : بۆچی بووە ؟ چ باسە ؟ ڕوی کردە (تئودول)و گوتی : تۆ لاتوایە کە(ماریوس) نات ناسیو نازانی کە تۆ کوڕی خوشکی باپیری ؟ گوتی : مـن ئەو دەناسم ، بەڵام ئەو من ناناسی • ووتی : کەواتە زۆر باشە ئێوە هەردوکتان بەگاریەیەك دەڕۆنو دەزانی ئەو گاریە بۆکوێ دەچێ • ـ دەچێ بۆ (لەندلیس) • (ماریوس)یش دێ بۆ وێ ؟ ئەگەر وەك مـن لەڕێگا دا نەبەزی بەڵێ • مـن لە (ورنون) دادەبەزمو دەچم بۆ (گیلوان) ، بەڵام نازانم (ماریوس) بۆ کوێ دەچێ ؟ ووتی : گوێبکرە (تئودول) (ماریوس)لەو دوایەدا بەتەواوی گۆڕاوەو کەم وەماڵێ دەکەویتەوە • ئاخ بمزانیبا بۆچی ئەوەندە دەچێتە سەفەرو لەماڵ ناخەوێ ؟ (تئودول) گوتی : منیش زۆرم پێخۆشە بزانم ، دەبێ عاشق بووبێ ؟ دیارە ئەو ماستە بێ موو نیە ؟ گوتی : ئەوە ئاشکرایە ، بەڵام تۆ دوای کەوەو هەوڵ بدە دەسگیرانەکەی ببینی ، ئەو پیاوەتیەمان لەگەڵ بکەو لەپاشان بە نامە بۆمان بنوسە ، باپیری زۆری پێخۆش دەبێ ! ووتی : بەدڵی ئێوە دەکەم ، هەستا ماڵئاوایی کردو ڕۆیشت !

(ماریوس) شەوی دوایی بێئەوەی بزانێ کە کەس تاقیبی دەکا ، سواری گاریە بوو • (تئودول) چوو لەبەرامبەری وی سوار بوو ، وەك هەموو جاسوسێك بەقەستی خەوی لەخۆ خست • کە ڕۆژ بۆوە گاریەچی هاواری کرد (ورنون) ـ (ورنون) کێ لە (ورنون)دا دەبەزی ؟

(تۆدول) وەخەبەر هات‌و بەخەواڵوەوە گوتی : کاکــە مـــن دادەبەزم • کە دابەزی هاتەوە سەرخۆو تەماشایەکی دەورو بـــەری خۆی کردوو لە بەرخۆیەوە گوتی : لەوانەیە (ماریوس) لەگاریەکــە دابەزی بێ ؟ لەڕاستیدا گاریەکە ماوەیەك بوو ڕاوەستابوو • لەوکـاتەدا چاوی بەدوو نەفەر کەوت لەلای ئەسپەکانی گـاریەکە ڕاوەستا بوون‌و کچێکی گوڵ فرۆش گوڵی نیشان دەدان •

لەو دوو کەسە یەکیان (ماریوس)بوو چاوی لێبوو کە کچەکـە نزیك بۆوەو جوانترین دەستە گوڵی لێی کڕی • کەوای چاو پێکەدت ، بەخاترجەمی لەگاریەکە دور کەوتەوەو لەدڵی خۆیدا گوتی : چـــاکی بۆچووم ، دەبێ ئەو ژنە کێ‌بێ کـــە ئەو گوڵانەی بۆدەبا ؟ حـــەتمی ئافرەتێکی زۆر جوانە ، دەبێ هەر چۆنێك بێ ببینم : قانون‌و وەزیفەی لەبیرچۆوەو دەیگوت : دەبێ هەر بزانم داخوا (ماریوس) بۆچی لـــە (ورنون) دابەزی‌و ئەو گوڵانە بۆکێ دەبا ؟ ئایا بەڕاستی عاشقە ؟

(تۆدول) چاوی لێبوو (مـــاریوس) چوو بۆلای کلیسا ، بەڵام لەباتی ئەوەی بچێتە ساڵۆنی کلیساکەوە ، چوو بۆ پشتی بینای کلیساکەو لە گۆشەیەکدا وون‌بوو • لەبەرخۆیەوە گوتی : وادیارە وەعدەکەیان بۆ ژوان پشتی ئەو بینایەیە ، بابچم بزانم ئەو کچە چۆنە ؟

بەسپاوی بێ‌خشپە چـــوو کەڕوانی ئـــەوا (ماریوس) دەستی بەچاوانەوە گرتووەو لەبەرامبەر قەبرێك لەسەر سەوزە گیا بەچۆکـدا هاتووەو دەستە گوڵەکەی لەسەر گۆڕەکە بڵاو کردۆتەوە •

لەسەر گۆڕەکـــە سەلیبێك لەداری ڕەش بوو ، چەقیوەو بەپیتی سپی لەسەری نوسرابوو ـ (کلنل بارون پونت مرسی) • ( ماریوس )

لەسەری دەگریا ، ئاشکرا بوو کە خۆشەویستەکەی ئەو گۆڕەیە ٠ ٠
دەرکەوت کە (ماریوس) هەر شەوێك لەمـــاڵ نەبووبێ ، چۆتە وێ ،
(تۆدول) کەئەو دیمەنەی دی دڵی داچەنیو بەپەشۆکاویو بێدەنگ
تامـاوەیەك تەماشـا یەکتریان کردو لەپاشـــان هەریەکـەیان بەلایەکدا
ڕۆیشتن ٠ بەیانی ڕۆژی سێیەم (ماریوس) گــەڕایەوە بۆ (پاریس)ی
چۆوە ماڵی باپیریو یەکسەرە چۆ ژوورەکەی خۆیو کۆتو قەیتـانە
ڕەشەکەی ملی دانا ڕۆیشت بۆ حەمام ٠ (ژیلنورماند)ی باپیری وەکو
هەموو پیاوێـکی پیر زوو وەخـــەبەر هـــاتبوو گوێی لەدەنـگی پێی
(ماریوس)بوو ، بەپەلە هات تا نەوەکەی ببینێو ماچی کـــاو پرسیاری
لێبـکـو بزانێ بۆکوێ چووەو لەکوێوە هاتۆتەوە ؟ بەڵام فریای نەکەوت
تەماشای کرد کۆتو قەیتانە ڕەشەکەی ملی لە جێگا کەنی ، کۆتەکـەی
بەدەستێكو قەیتانەکەی بەدەستەکەیترەوە بوو چۆ ژووری کچەکـەیو
گوتی : وردە وردە گرێکوێرەکە دەکرێتەوە ، ئێستا ئاشکرا دەبێ کـە
( ماریوس ) چیـکردووەو بۆکوێ چـــوە ؟ گوتی : گرێکوێرەکەم
حەلکرد ، چونـکە قوتولێکی بچوك بەقەیتانەکەوە هەڵاوەسـرا بوو ٠
دەتـگوت : هەنگی لەداردا دیوەتەوە ، قوتووەکەی بەدەستەوە گرتبوو ،
بێ ئەوەی بزانی چیتێدایە وای تەماشا دەکرد دەتگوت : ئینسانێکی برسی
فەقیرە ، چاوی لەخواردنێکی خۆشە ، بەڵام ناتوانێ دەستی بۆبەرێ ٠
کچەکەی ووتی : باوکە بێنە بزانم ئەوە چیە ؟ دوگمێکی پێوەبوو دەستی
پێـدا هێناو کرایەوە ، پارچە کاغەزێـکی تێدابوو ٠ (ژیلنورماند)ی پیر
لەقاقای پێکەنینیداو گوتی : بەڵێ ئەوەیە کەدەمگوت : نامەی عاشقانەـئەو
کوڕە عاشقە ؟ کچەکە گوتی : بێنــە باوەی خۆینم : عەینەکی کردەچاوو
باوکەکەی کاغەزەکەی هەڵپچڕی خۆینـدیانەوە نووسرا بوو ، بۆکوڕی
خۆم ٠ ـ لەشەڕی (واترلو)دا لەلایەن ئیمپراتۆرەوە لەقەبی (بارون)م

درایە ، ئێستاش ئەو لەقەبە دەبەخشم بەکوڕەکەم ، چونکە بەخوێنی خۆم دەستم کەوتووەو کوڕەکەشم شایانی ئەو لەقەبەیە • لەو شەڕەشدا ئەفسەرێك بە ناوی ئاغای (تناردیە) منی لەمردن رزگارکرد ، ئەگەر تووشی بوو هەرچی لە دەستی دێ کورەکەم چاکەی لەگەڵ بکا •

ئەو حاڵەتەی بەخوێندنەوەی ئەو وەسیەت نامەیە بەسەر ئەو باوكو کچە داهات یاخوا بەسەر کەسدا نەیە ، تاماوەیەك زمانیان لاڵ بوو ، قسەیان نەکرد ، لەئاخریدا (ژیل‌نورماند) وەك لەگەڵ خۆی بدوێ ، لەبەر خۆیەوە گوتی : ئەوە دەست خەتی بابە پیاو کوژەکەیەتی • کچەکە بێ دەنگ کاغەزو کۆتو قەیتانەکەی هەڵگرتو چوو بێ هەست لەسەر جێگاکەی دای‌نانەوە • لەوکاتەدا بەستەیێکی بچوك لەکاغەزێکی بۆرەوە پێچرا بوو ، لەگیرفانی کۆتەکەی بەربۆوە ، هەڵی‌گرتەوەو هەڵی پچڕی سەت کارتی بەناوی (ماریوس)تێدا بوو ، یەکێکی هێناو دای‌بە باوکی • بەدەنگی بەرز خۆیندیەوە ، نووسرا بوو ـ (بارون ماریوس پونت مرسی ) • لەو کاتەدا (ماریوس) لەحەمام هاتەوە ، تەماشای کرد کارتێك بەدەست باپیریەوەبوو • باپیری بەگاڵتەوە گوتی : ڕاوەستە ! ڕاوەستە ! ئێستا تۆ (بارون)ی ؟ پیرۆز باییت لێ‌دەکەم ، بەڵام بڵێ بزانم ئەوە مەعنای چیە ؟

(ماریوس) سوور هەڵگەڕاو گوتی : مەعنای وایە من کوڕی باوکی خۆمم • (ژیل‌نورماند) بەڕقەوە گوتی : باوکت ؟ من باوکتم :

ئنجا (ماریوس) لەسەرخۆ گوتی : باوکی من پاڵەوانێکی ئازاو ڕەشید بوو • خزمەتی وەتەنو خەڵكو جمهوری فەڕەنسەی کردووە ، گەورەترینی پیاوە گەورەکانی مێژوبوو ، کە سێیەکە قەرنێك لەجەبشدا بوو • بەرۆژ لە ژێر ڕەحمی گوللە تۆپداو ، بەشەو لەبەر

بەفرو باراندا ژیاوە ، پیاوێك بوو نیشانەی بیست برینی پێوە بوو ، بەڵام زۆر بە داخەوە بەبێ ناوی لەدنیا دەرچوو ، لەبیرچۆوە ، ئەو هەر ئەو گوناحەی بوو کەوتەن‌و منی خۆش دەویست •

(ژیل‌نورماند) خۆی بۆ ڕانەگیراو هەستایە سەرپێ ، چونکە هەریەکە لەو قسانە وەك پشکۆیەك سەرو سیمای ئەو سەڵتەنەت تەڵەبەی دەسووتاند • ڕەنگی ڕەشی سور هەڵگەڕاو گۆڕا بەئەرخەوانی ، وەك پشکۆ سوربۆوەو گوتی : کوڕم ئەوانە لەوکاتەدا خزمەتی (روبسپیر)یان دەکرد ، هەموویان دزو خاین بوون • لەترسی ئینگلیسەکان هەڵاتن بۆ (واترلو)و بوونە هۆی شکانی فەڕەنسە •

ئنجا نۆرەی (ماریوس) هات ، وەك ئاگر گڕی‌گرت،چونکە ڕازی نەبوو ئەو تەوهینە بەباوکی بکرێ • ماوەیەك پەشۆکاو لەپاشان وەك شێر نەڕاندی گوتی : بمرن (ریون)ەکان‌و (لوئی) هەژدەهەم ! (ژیل‌نورماند) ڕەنگ‌و ڕووی وەك مووەکانی سپی‌بوو پەشۆکاو گوتی : (بارون)ێکی وەك تۆو بورژووازێکی وەك‌من ناتوانن لەخانوێکدا بژین • دەماری ملی هەستان‌و لەرزی‌و بەتوڕەییەوە دەستی بۆلای ( ماریوس ) درێژکردو بەتوندی گوتی : بڕۆ دەرەوە ، ( ماریوس ) بێدەنگ هاتەدەرەوە • ڕۆژی دوایی (ژیل‌نورماند) بەکچەکەی ووت : هەر مانگ جارێك پارە بۆ ئەو خوێن‌مژە بنێرەو جارێکی‌تر لای من ناوی مەبە • (ماریوس) بەئاشکرا بێدەنگ‌بوو ، بەڵام لەدڵدا بەکۆڵێك ڕق‌و کینەوە ڕۆیشت‌و ئەوەی لێرە بەدواوە باسی دەکەین لەجاران زیاتر ناڕەحەتی دەکا • خزمەت کارەکەیان بەئەمری (ژیل‌نورماند) شتەکانی بۆ دەبردە ژورێك بیاندا بە (ماریوس) • لەسەر قادرمەکان حەمایەڵەکەی بەقەیتانە ڕەشەکەوە لێ‌کەوتەخوارەوەو دۆزیەوە ، (ماریوس) لای‌وابوو

باپیری فرێیداوە یان سوتاندویەتی ! لەداخان عەرەبانێکی بەکرێ گرت و چوو بۆ گەڕەکی (لاتینی) •

## « هەژاری ماریوس »

ژیان تینی بۆهێنا ، ڕۆژ لەدوا ڕۆژ ناڕەحەت تردەبوو ، ـ فرۆشتنی کۆت و سەعات بۆپارەوە نانێك ، بەڕاستی تاڵی ژیان بەزەحمەت هەزم دەکرێ ! ڕۆژانی بێ نان و ، شەوانی بێ خەو و بێ چراو ، ئاگردانی بێ ئاگروو ، دوا ڕۆژی تاریك و ، کۆتی بێ ئەنیشك و کلاوێ کە کچانی جوان پێکەنینیان پێ دەهاتێ ، دەرگا لەسەر پێوەدان و ، لەبەر کرێ نەدان لەخانوو دەرکردن و ، گاڵتە پێ کردنی دراوسێی و ، غەم و پەژارە ، بەنۆرە سلاویان لێ دەکرد ، رۆژی وابوو بۆ پارەوەنانێك وڵاتی دەماڵی ، لەژورێکی تاریك و بچوکدا زۆر ناخۆشی لێ دەگوزەرا •

لەبازاری گۆشت فروشان رۆژێك گەنجێکی شێواو دوو کتێبی بەدەستەوە بوو ، ئارەقی بەناوچاواندا دەهاتە خوار ، لەبەر دەمی شاگردە قەسابێك ڕاوەستاو داوای گۆشتی قیمەی کرد • قەسابەکە بەخێراخۆی پێنج شەش کوتی دایە ، لەسەر پشتی کتێبەکانی داناو ڕۆیشت • ئەو گەنجە (ماریوس)بوو سێ شەو بەو کوتە گۆشتانەی ڕابوارد • پووری جارجار پارەی بۆدەنارد ، بەلام بۆی دەناردەوە ، وەری نەدەگرت • تازیەی باوکی نەشکاند بوو ، زۆر دەست کورت بوو ، (کورفی‌راکی) دۆستی کۆتە کۆنێکی بۆهێنا ، بردی لەلای خەیات ئاوەژوی کردەوە ، بەلام لەبەر ئەوە ڕەنگی سەوز بوو ، بەرۆژ لەبەری نەدەکرد بۆدەرەوە، هەربەشەو پێیەوە دەگەڕا •

ئاخری خواکردی ئیجازەو شەهادەی خوێندنی لەزانستگای حقوقدا تەواو کردو چوو لەگەڵ (کورفی‌راك) لە ژورەکەی‌دا بوو بەهاورێ •

(کورفی‌راك) کتێبی حقـوقی زۆر بوو • (ماریوس) دەستی کـرد بەموتالآیان • کاتێ شەهادەی وەرگرت لەنامێکی زۆر جواندا بۆ باپیـری نووسی کە بۆتە مەحامی باپیری بەدەستــــە لەرزۆکەکانی نامەکــەی خوێندەوەو وردی کردو خستیە ناو تەنەکەی خۆڵەوە •

## « ماریوسی بێ نەوا »

بەدبەختی‌و هەژاری وەك هەموو شتێکی‌تر سنورێکیان هـــــەیە • رۆژێك دێ بەپلەی دوایی‌بگەن • (ماریوس) دەورانێکی پڕ لــــەرەنج‌و مەینەتی گوزەراندو پێی نایە ڕێـگایەکی پانترەوە • بەهۆی کـارکردنی بێ‌وچانیەوە دەرامەدی ساڵانە گەیشتە حەو سەت فرانك • ئافەرین بۆ (کورفی‌راك) کە بوو بە هۆی پێشکەوتنی ئەو کوڕە گەنجەو بەدۆستێکی خۆی ناساندو لای دامـــــەزراند • (ماریوس) زمانی ئەڵمانی‌و ئینگلیسی بەباشی دەزانی‌و رۆژنامەو داستان‌و ژیان نووسی بۆکابرا تەرجەمە دەکردن

ژورێـکی بچووکی لەگەڕەکی فەقیران لە (پاریس) بەکرێ گرت مانـگی بەسیی (فرانك) مانـگی سێ فرانکیشی دەدا بەئافرەتێك ژورەکەی بۆ خاوێن بـکاتەوە • خولاسە ، ساڵانە بەخواردن‌و کرێ‌خانوو بەرگ‌و لیباس‌و هەموو شتێـکەوە شـەش سەت‌و پەنجا فرانـکی خەرج دەکردو پەنجا فرانکیشی بۆ دەمایەوە • لەوانەیە بڵێن : خۆیندنەوەو نووسـینی ئەو مەبەستانە کەڵـکی چی‌هەیە ؟ ( ماریوس ) پاشی چـــەند ســـاڵ کوێرەوەری گەیشتە ئەو تۆزەژیانە خۆشە • کار نەما نەی‌کا ؟ بۆ ئەوەی چاو لەدەست‌و قەرزداری خـــــەڵك نەبێ ، لـەبەر فەقیری بە زۆری

بەرۆژوو دەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا ورەی بەر نەداو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هیوای بەسەرکەوتن زیاتر دەبوو • باوکیو (تناردیە)ی قەت لەبیر نـە دەچوونەوە هەوڵی چاو پێـــکەوتنی ( تناردیە )ی زۆر دابوو نـــەی دۆزیبۆوە ، زۆری پێ ناخۆش بوو ، لەبەرخۆیەوە دەیگوت : ئـــەو باوکی منی لەنێو ئاگرو دوکەڵی شەڕدا لەکۆڵ کردو رزگاری کـــرد لەمرن ، بەڵام من بەوەسیەتی باوکم قەرزداریشمی ناتوانم قـەرزەکەی بدەمەوە • دەبێ هەر وەی دۆزم !

## « دەبی بە پیاوێك »

تەمەنی بوو بەبیست ساڵ سێ ساڵ بوو باپیری نەدیبوو ، هـــەر دوکیان وەك خـــۆیان مابوونەوە ، مـــەیلیئاشتیان نەبوو • (ماریوس) بەغەڵەت لەباپیری گەیبوو ، وای دەزانی قەتی خۆش نەویســـتووە ؟ ڕاستە باوکی وا هەیە کوڕی خۆش ناوێ ، بەڵام هیچ باپیرێك نیە نەوەی خۆش نەوێ •

ناوە ڕاستی ساڵی ١٨٣١ بوو ، ڕۆژێك ئافرەتە خزمەتکارەکـــە ووتی : فەقیرەئەو ماڵە دراوسێ فەقیرەمان دەر دەکەن • • مـاریوس ) پرسی بۆچی دەریان دەکەن ؟ گوتی : کرێی دوو مانگ خـانوو قـەرز دارن • گوتی : چەندە ؟ پیرێژن گوتی : بیست (فڕانکە) • (ماریوس) دەستیبرد بیستو پێنج فڕانـکی دایەو گوتی : بۆیان بەرە ، بیســـتی بۆ قەرزەکەو ، ئەویتری خەرج کەن •

# « پێك گەیشتنی دوو ئەستێرە »

(ماریوس) بۆتە گەنجێکی باڵا مامناوندی ، نەدرێژە ، نەکورت ، مووی ڕەش‌وو ، برۆی جوان‌و ، لووتی ڕاکشاوو ، کوڕێکی نەسەرخۆو پاکداوێن‌و ، هەمیشە دەم بەپێکەنین .

کە کچ لەداشگا دەگەڕانەوەو تەماشایان دەکرد ، ئەوەندەی پێ ناخۆش بوو خۆی دەشاردەوە ، وەی دەزانی بەجل‌و بەرگە کۆنەکەی پێدەکەنن ؟ بەڵام لەڕاستیدا کچەکان عاشقی وێنەی جوان‌و ، خـــوو ڕەوشتی بەرزو داوێن پاکیەکەی بوون‌و ، خەویان پێوە دەدی .

کەچی ئەو عەلاقەی بەکەسەوە نەبوو ، بەکتێبەوە نەبێ . زۆر جار (کورفی‌راك) ئامۆژگاری دەکردو دەیـــگوت : ئەوەندە موتاڵای کتێب مەکە ، تەماشایەکی دنیاش بـکە ، جـــاری واش‌بوو بەگاڵتــەوە پێی دەگوت : سەلام ئاغای قەشە . (ماریوس) لەداخانی حەفتەیەك قسەی لە گــەڵ نەدەکردو کەسی نەدەدواند ، پیرێژنە کارەکەرەکەو کچێــکی بچوك نەبێ . لەماوەی ساڵێك زیاتردا لەپیاسە کردندا ، پیاوو کچێـکی دەدی کەهەمیشە لەتەنیشتی یەکتردا لەســـەر کورسی‌یەك دادەنیشتن ، لەنزیك خیابانی (اورست) . پیاوەکە تەمەنی شێست ســــاڵ دەبوو ، دەتـگوت : ئەفسەری موتەقاعیدە ، بەڵام زۆرمیهرەبان دەهاتە بەرچـاوو زۆر بەکەمی لەخەڵـکی دەڕوانی ، کۆتێکی ئاوی ڕەنگی لەبەردا بوو ، شەپکەیەکی پانی لەسەر بوو ، گراواتێکی ڕەشی لەملدابوو . مـووی سپی بوون . کچەکەش تەمەنی سێزدە ، چواردە ساڵ دەبوو . چـــاوی گەش‌و جوان بوون ، لیباسی قووتابی ئایینی لەبەردا بوو ، لێی نەدەهاتن، وادیار بوو باوك‌و کچ بوون . هەموو ئێوارەیەك بەلایاندا دەگـەڕایەوە ،

بێ ئەوەی خۆ بەیەکتر بناسێنن ، وا دیار بوو ئەو باوکو کچە نەیان دەویست کەس بیان بینی ، قووتابی دانشگا ، کە بەوێدا دەهاتن‌و تەماشایان دەکردن ، کابرا زۆری پێ ناخۆش‌بوو • (کورفی‌راك) یەکێك بوو لەو قووتابیانە • جارێك ویستی چاو برکێك لەگەڵ کچەکە بکا ، بەڵام لەبەرئەوەی بەرگی قووتابی ئایینی لەبەردا بوو ڕۆیشت‌و ناوی کچەکەی نا • (لنور)ی ڕەش‌و پیاوەکەشی نا ـ (لوبلانك)ی سپی • جا لەبەر ئەوەی کەس ناوی نە دەزانین ، ئەو ناوەیان بەسەردا بڕا • هەموو ڕۆژێك ئەو دیمەنەی دەدی‌و (ماریوس) هەستی بەعەلاقەیەك دەکرد لەگەڵ پیاوەکەدا •

واڕێکەوت تا نزیکەی شەش مانگ ( ماریوس ) ئەو عادەتەی تەرك‌کردو بە وێدا نەدەچوو • تا ڕۆژێکی هاوین بەوێدا چووەوە پیاوەکەی ناسیەوە ، بەڵام لای وابوو کچەکەی جاران نیە زۆرجوانتر بوو ، پرچی بەڕو ڕەنگ‌و ، گۆنای گوڵی‌سوربوو ، دانی‌مرواری‌و ، دەنگی وەك نەغمەی مووسیقا بوو ، لووتی نە درێژ ، نە کورت بوو • نە وەك کچی ئیتالی ، نە وەك یونانی بوو ، دەتگوت : لووتی کچێکی (پاریس)ی‌یە ، وەك ئەو لووتە دەچوو کەوێنە گروو شاعیر دەی‌کێشن‌و وەسفی دەکەن •

لەئەووەڵەوە وای‌زانی ئەوە کچێکی‌ترەو بێ‌شك خوشکی کچەکەیە ، بەڵام کە بەلایاندا ڕۆیشتەوە ، تەماشای کرد ، زانی کەهەر خۆیەتی گەورەو جوان تربووە ، هەر وەك چۆن سێ ڕۆژ بەهار بۆ پشکوتنی گوڵی بەهار بەسە ؟ هەروەهاش شەش مانگ بۆجوان‌بوون‌و گۆڕانی کچێك زۆرە •

ئەو وەك کچە قووتابیە ئایینیەکەی جاران نە دەچوو ، کراسێکی

ڕەشی تەنـکی لەبەردا بوو ، کلاوێـکی جـوانی لەسەر بوو ، دەست کێشی سپی لە دەستدا بوو ، چەترێـکی دەسكعاجی بەدەستەوە بوو ، کەوشێکی پاژنە بڵندی لەپێدا بوو ، بۆنی خۆشی کونە لووتی ئینســانی پڕدەکرد ، بەڵام پیاوە پیرەکە هەر وەك خۆی بوو .

بۆجاری دووەم کەبەوێدا چوو کچەکە سەری بەرزکردەوە زۆر ئارام بوو . بەڵام ئاسـاری منداڵی پێوە دیاربوو . بەچاوێـکی وا تەماشـا (مـــاریوس)ی کرد ، وەك لەوەلاغێك بڕوانی . ڕۆژی دوایی کـــە ( ماریوس ) بەوێدا ڕۆیی ، زۆری لێ ڕوانی ، چونکە تازە ئەو کچەی ڕۆژان نەبوو ، زۆر جوانتر ببوو ، زۆر ڕو بازاڕی بوو . جـــاران لەکەسی نەدەڕوانی ، ئێستا چاو دەگێری . ڕۆژێك هەوا زۆر خۆش و مولایم بوو . گەردشـــگای ( لوگزامبورك ) بەهـۆی تیشکی ڕۆژەوە شکۆیەکی تایبەتی بەیدا کردبوو ، ئاسمان ئەوەندە ساف بوو ، دەتگوت : بەیانی زوو فریشتان شتوویانەو خاوێنیان کردۆتەوە . باڵندە لەناو گەلاو لەخە داراندا هێلانەیان کردبوو . (ماریوس) ڕوحی خۆی دابۆ دەست سروشت و بیری لەهیچ نە دەکردەوە . بەلای کورسی‌یەکەیدا تێ‌پەڕێ، کچەکـــە ســەری بەرز کردەوەو چـــاویان بەیەکتر کەوت . بەڵام تەماشاکردنی کچەکە چی لەژێردا بوو ؟ (ماریوس)یش پەی پێ نەبرد . کچەکە ســەری بەردایەوەو (ماریوس) دەستی‌کرد بەقەدەم لێـدان . تا شەو داهات و چۆوە ژورەکەی خۆی . تەماشایەکی سەرو ڕوی خۆی کرد ، بۆ یەکەم جار هەستی بەخەجاڵەتی کردو ناڕەحەت بوو لــەوەی کەتا ئێستا بە لیباسی کۆنەوە چۆتە گەردشگای (لوگزامبورك) . چونــکە لێوارەی کلاوەکەی شکا بوو ، چەکمەکانی دڕابوون ، شاڵوارەکەی سەر ئەژنۆکەی پینە کرابوون . ڕۆژی دوایی هەمووی گۆڕین و ئی تازەی

لەبەرکردو چوو بۆ گەڕان • لەڕێـگادا لەدوورەوە (کورفی‌راك)ی دی، بەلام خـۆی لێ لادا ، وەی زانی ئـەو نەی دیوە • (کورفی‌راك) بەهاوەڵەکانی گوت : گوڕینە ، ئێستا (ماریوس)م دی خۆی گۆڕی بوو دەتگوت : بۆ ئیمتیحان دەچی وەك شێتان دەچوو • (ماریوس) شالاوی برد بۆلای ئەو پیاوو کچـە دەتگوت : (آنیبال)ە شالاو بۆ ڕۆم دەبا ، بەلام کەنزیك بۆوە شەرم گرتی‌و هێواش بۆوە ڕاوەستا • بێ ئـەوەی ئاگای لەخۆ بێ گەڕایەوە دەتگوت : نۆینەری مەجلیسە تەماشـا لای ڕاستو لای چەپی خۆی نەدەکردو لەشەرمان سـور هەڵـگەڕا بوو ، کچەکـە کراسێکی جـوانی لەبەرکردبوو ، کلاوی لەسـەر بوو ، بەدەنگێکی ناسك قسەی دەکردن • (ماریوس) هەر چەند سەری بەرز نەکردەوە ، بەلام دەی زانی کچەکە زۆر جوان بووە •

نە چۆ لایان ، بەلام دور لەوان لەسـەر تەختێك دانیشتو لەبنەوە تەماشا دەورو بەری خۆی‌کردو کەوتە گێژی بیرکردنەوە • لەپاشـان هەستا بەلایەکی تردا چۆوە ماڵەوە ، ئەو ڕۆژە لەبیری چۆوە بچی نانی نیوەڕۆ بخوا ؟ خۆی گۆڕی‌و لێی نووست •

ڕۆژی دوایی پیرێژنە خزمەت کارەکە کە (ماریوس)ی دی خۆی گۆڕی‌و ڕۆیشت زۆری پێ سەیر بوو ، بە پەلە وەدوای کەوت ، بەلام لەپاش دوو دەقیقـە لێی ون بوو ، بەهەناسـە بڕکێ گەڕایەوەو گوتی : سەیری چەند ئەحمەقە ، دەڵێی مەجبورە لیباسی تازە لەبەر بـکاو ئاوا خەڵك ماندو بـکا بە دواخۆیدا •

لە یەکێك لەڕۆژەکـانی ئاخری هەفتەی دووەمدا چـوو لـە گەردشگاکـە دانیشت و کتێبێکی یاری بەدەستەوە گرت • لەنـکاو موچڕکێـکی پێداهات ، چونـکە ڕو داوێـکی گرنـگ ڕوی دەدا •

(لوبلانك)و كچەكەی بەرەو ئەو دەهاتن • كتێبەكەی لێك كردەوەو بەقـــەستی خەریـكی موتالاّ بوو ، بەلاّم سەرتا بەخواری دەلـــەرزی لەشەرمان ، لای وابوو قەڕێنك دەخایەنێ تا دەگەنە لای • بەلاّم بەچەند سانیە نزیك بوونەوە ، لەشەرمان سەری بەردایەوەو گوێی لەهـەستی قاچیان بوو • وەی دەزانی باوكی كچەكە بەتوڕەییەوە تەماشای دەكا ؟ لەدڵی خۆیدا دەیگوت : دەبێ قسەم لەگەڵ بكا ؟ كاتێ بەسپاوی تۆزێك سەری بەرزكردەوە ، زۆر نزیك ببوونەوە ، كچەكە بەلایدا تێپەڕیو تەماشایەكی كرد پڕ بوو لەخۆشەویستی و (ماریوس)ی هێنایە لەرزین • وەیزانی بەقەستی لایدا هات ، چونكە ئەو نەچۆتەلای وان بەزمـــانی تەماشای دەڵێ : ئەوەمنم دێم بۆلات • (ماریوس) بەتیشكی چاوی ئاگری لەجگەر بەر بوو ، چ لەنزیك بوونەوەی خۆشەویست خۆشترە ؟ زۆر لەجاران جوانتر بوو ، دەتگوت : فریشتەیە • (ماریوس) ئەسیری داوی عیشق بوو ، بەرەو دوا ڕۆژێكی نە زانداروو نا دیاری دەڕۆیشت •

## « ڕوداوی پیتی ئەلف »

(ماریوس) یەك مانگ لەســـەر یەك هــەموو ڕۆژێ دەچـــۆ گەردشگاكـــە • ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ گـــەرمتر دەبوو ، وردە وردە لەسەندەڵییەكەیان نزیكتر دەبۆوە • بەلاّم هەموو جارێك بەپێشیاندا دەڕۆیی • ئەوەش یەكێك بوو لـە كردەوە جوانەكانی عاشقان • كە لە گەڵ ئەوەشدا مەعشوقەكەیان نەناسیوە ، زیاتر شـــەرم دەكـــەن • (ماریوس)وای بەچاك دەزانی كـــابرا پیرە نەی بینێ ، والەپشتی دارو ناو گیادا ڕادەوەستا كەهـــەر كچەكە چـــاوی پێ بكەوێ ، بەلاّم پیرە بەتەواوی زانی بوویو جێگای دانیشتنی گۆڕی • كات لە دوا كـــات

ئاگری عیشق زمانی دەکێشاو بڵێسەی گڕی لەدڵی (ماریوس) بەردەدا • هەموو شەوێك لەخەودا کچەکەی دەدی ، تا هەڵێك ڕوی‌دا کـــە ئیتر چاوەڕوانی نەبێ • جارێك کاتی رۆژ ئاوا بوون دەستە سرێـکی لەسەر کورسی‌یەکەیان دۆزیەوە سادەبوو ، بەڵام بۆنی زۆر خۆش‌بوو • فەوری هەڵی‌گرتەوە تەماشای کرد ئەو دوو (١ـف) پیتەی لەسەر نووسرایوو ، ماچی‌کردو گوتی : ئەوە مەعنای وایە ناوی (اورسولا)یە • دەیگوت : بەڕاستی ناوێـکی خۆشە • بەپەلە چۆوە ماڵەوە دەسرەکەی ماچ‌کردو ،ەبۆنیەوەکردو لەسەر دڵی‌داناو خەوی لێ‌کەوت • لەڕاستیدا لەگیرفانی کابرا‌پیرە کەوتبۆ خوارێ •

## « ڕۆژ ئاوا بوون »

زۆر ســـەیرە ؟ تینوایەتی ئارەزو لەگەڵ عیشق دەگەڕێو رۆژ لەدوای رۆژ پەرە دەستێنێ • ناوەکەی دیاری‌کرد ، دەی‌ویست بزانێ لەکوێ دەژی‌و لەکوێن • ئاخری ڕونی کردەوە کـــە لـــە خیابانی (لواورست) لە خانوێـکی سێ قاتی تازە دان • نەشەی بزوت‌و ویستی بزانێ کیەو چ کـــارەیە ؟ ئێوارەیەك دوایان کـــەوت تاچوونەوە ناو خانوەکەوە • بەدوایاندا چـــۆ ژورەوەو بەخاوەن خانوەکەی گوت : ئەرێ کاکە ئەو ئاغـــایەی ئێستا چۆ ژورەوە لەقاتی یەکەم دایە ؟ ـ گوتی : نەخەیر لە قاتی سێ‌یەمـــە • گوتی : ئەی چ‌کارەیە ؟ گوتی : بەداهاتی خوێ دەژی ، پیاوێـکی زۆر میهرەبانە ، هەر چەند دەوڵەمەند نیە ، بەڵام هەمیشە دەستی فەقیرو هەژاران دەگریتەوە •

پرسی ئەی ناوی چیە ؟ کابرا سەری بەرزکردەوەو گوتی : ئەرێ جـــەنابت پۆلسی ؟ ئەمنی ؟ (ماریوس) بێ‌دەنگ چۆ دەرەوەو لـــەبەر

خۆیەوە گوتی : هەرباش بوو ، خۆ زانیم کە کچی پیاوێکی کارمەندی میری تەقاعود کراوە •

رۆژی دوایی چوونەوە پیاسە ، بەڵام ئێستا دنیا هەر ڕوناك بوو کە گەڕانەوە ، کچەکە چۆ ژورەوەو کابرا ئاوڕویدایەوە بەچاوێکی سەیر لە (ماریوس)ی ڕوانی‌و ڕۆیشت • خولاسە تا یەك حەفتە لەو رۆژە بەدواوە (ماریوس) چاوەڕوانی دەکردن نەهاتنەوە بۆ پیاسە • رۆژی هەشتەم چوو تەماشای کرد چراکەشیان نەدایسا ، بەغەمباریەوە گوتی : یەعنی چی ؟ ئێستا چراکەیان هەڵنەکردووە ؟ خۆ تاریکە دەبێ نەچووبنەوە دەر ؟ تا سەعات دە تا نیوە شەو •• تا سەعات یەك چاوەڕوانی‌کرد ، بەڵام چراکە هەر هەڵنەکراو کەس نەهاتەوەماڵ • زۆر بەناڕەحەتی گەڕایەوە • رۆژی دوایی لە گەردشگاکە هەر نەی‌دین، ئێوارە بەکۆڵێك خەفەتەوە چوو لەدەرگای خانوەکەی‌دا ، خاوەن خانوو هات‌و گوتی : ئەرێ کاکە ئەو ئاغایەی لەو خانوەدا بوو لەماڵە ؟ گوتی : کاکە لێرە ڕۆیشتوون • پرسی گوتی : کەی ڕۆیشتوون ؟ ووتی : دوێنێ • ووتی : بۆکوێ چوون ؟ گوتی : نازانم •

## « ناخۆشی »

هاوین‌و پایز تێ پەڕین‌و زستان داهات ، لەو ماوەدا نە ئاغای (لوبلانك) نە کچەکەی پێیان نەنایە گەردشگای (لوکزامبورك) • ئیتر تەنیا (ماریوس) هەر ئەو خەیاڵەی لەسەردا مابوو کە خۆشەویستەکەی ببینێ‌و جارێکی‌تر بە دیداری شاد بێ‌و چاوی ڕون وەبن • زۆر گەڕاو هەوڵی دا سودی نەبوو • دەیان جار لەخۆی دەپرسی ـ دەیگوت : دەبێ بۆ بەدوایدا بگەڕێم ؟ تەنیا خۆ بەچاو پێکەوتنی شاد دەبووم ! ئەو

تەماشای دەکردم ، ئەوەندە بەس نە بوو ؟ خـــۆ دیاربوو منی خۆش دەویست • ئیتر چی ؟ دەیگوت : بەڕاستی مـن زۆر ئەحمـــەقم ••• لەجاران زیاتر ژیانی پێتاڵ بوو ، وەی ئەزانی ئەو دنیا پانو بەرینـەدا ئەنیایە • ئیتر هەدەفێـکی نە بوو ، دەستی لەگـەڕان بەدوا تەیرە ون بووەکەیدا ، باڵندە قەفەز شکاوە ڕاکردوەکەیدا هەڵگرت : وەك حەیوانی ئەسیری ناو قەفـــەز دەچـوو ، بەتوڕەیی‌و ناڕەحـــەتی بەملاو ئەولادا دەچـــوو •

ڕۆژێك بەڕێـــکەوت شتێك ڕویدا ، بوو بەهـــۆی گۆڕانی بیرو باوەڕی • لەیەکێك لەخیابانەکـــانی تەنیشت فولـــکەی (انوالیدس) • پیاوێـکی دی لیباسی کرێکارانی لەبەردابوو ، لەبن لێواری کڵاوەکەیەوە مووە سپیەکانی دەرکەو تبوون • (ماریوس) بەهۆی جوانی‌و گەشی ئـەو مووەسپیانەوە هەڵوێستێکی کردو وای هـــاتە بەرچـــاو کەئەوە ئاغای (لوبلانك)ە • هەمان موو ، هەمان ئەندام ، وەکو ئەو مەحزونو غەمبار • بەلاَم بۆچی ئەو لیباسەی لەبەرکردووە ؟ یەعنی چی ؟

## « گوڵێك لە شۆرەکاتا »

لەپاش چـەند ڕۆژ کچێکی جوان هـــاتە بنەدەرگای ژورەکـەی (ماریوس) لەپەنجەرە خڕە بچوکەکەوە ڕوناکی یەك هاتە ژورەوە • دیار بوو کچەکە ڕەنـــگی پەڕی بوو ، زۆر کزو زەعیف‌بوو • ( ماریوس ) لەجێگای خۆی هەستاو چوو بزانی ئەوە چیەو کێیە ؟ لەپێشدا لای وابوو خەونی دیوە ، بەلاَم زوو ئەو ئیشکالەی نەما • وێنەی کچەکـــەی بە ناسراو هاتە بەرچاوو گوتی : بلَێ : بزانم بۆچی هاتووی ؟

کچەکە بەدەنگێکی وەك دەنگی کارەکەری چارە ڕەش وەڵامی دایەوە گوتی : ئاغای (ماریوس) نامەم بۆهێناوی • چونکە ناوی (ماریوس)ی هێنا زانی کە کاری بەخۆیەتی ، بەڵام ووتی : دەبێ ئەو کچە کێ بێو چۆن ناوی من دەزانێ ؟

کچەکە بێ ئەوەی (ماریوس) فەرمووی بکا چوو ژوورەوەو نامەکەیدا بە (ماریوس) • بەسەر سامیەوە هەڵی پچڕی ، نووسرا بوو • دراوسێی میهرەبانم ، جوانی ڕوخۆش ! من لەو پیاوەتیەی کە تۆ سەبارەت بەئێمە کردوتە ئاگا دارمو زانیومە کە تۆ بووی کرێ خانووی شەش مانگت بۆ داوین • زۆرت لێ مەمنونم ، کچە گەورەکەم پێت دەڵێ : کە چۆن دوو ڕۆژی ڕەبەق ئێمە چوار سەر خێزان بێ پارووە نانێك سەرمان نایەوە • مێردەکەم زۆر نەخۆشە ، بەهیوایی ئەوەم کە دووبارە چاوت لێوە بێ • بەمرۆڤایەتیت سوێند دەدەم کە بۆت دەکرێ فریامان کەوە ئیمزا (ژوندرت) لەخواریشەوە نووسرا بوو ـ ئاغای (ماریوس)ی خۆشەویست کچەکەم چاوەڕوانی دەستوری تۆ دەکا •

لە کاتێکدا (ماریوس) زۆربەغەمو سەر سوڕمانەوە بیری لەو کچە دەکردەوە ، ئەو بەوردی لەژوورەکەدا دەگەڕا • کراسێکی کۆنی دڕاوی لەبەردا بوو ، بەبێ موبالاتی کورسیەکانی ئەمدیو ئەو دیو دەکردو دەستی لەلیباسی (ماریوس) دەداو بەسەر سوڕمانەوە دەیگوت : ئای ئاوێنەشت هەیە ! ئنجا دەستی کرد بەیاری کردنو دەنگی بەرزتر کردەوەو چوو بۆلای مێزەکەو گوتی : ئای کتێب ! لەپاشان کتێبێك لەسەر مێزەکە بوو بەدەستیەوە گرتو زۆر بەڕەوانی خوێندیەوە ـ (ژانرال) (بودن) ئەمری بۆهات کەپێنج پەل لەلشکرەکەی خۆی ئامادە بکاو بچێ بۆ (شاتوهوگوموات) کەڕاست لەناوەڕاستی (واترلو) دایە •

کچەکە تۆزێك بێ دەنگ بوو ، لەپاشان گوتی : ئاخ • (واترلو) من باشی پێ دەزانم : لەزەمانی زوودا مەیدانی شەڕ بووە • باوکم لەوێ عەسکەری کردبوو ، ئێمە هەموومان لەماڵەوە لایەنگری (ناپلئون)ین • لەپاشان ڕوی کردە (ماریوس)و گوتی : ئاغای (ماریوس) دەزانی زۆر جوانی ؟ لەوکاتەدا هەر دوکیان خەیاڵێکیان کردەوە ، کچەکە زەردە خەندێکی کردو ( ماریوس ) سور هەڵگەڕا • کچەکە چوو دەستی لەشانی داو گوتی : تۆ تەماشا من ناکەی ، من تۆ دەناسم • یەکەم جار تۆم لەسەر قادرمەکاندیو دوا جار کەچووی بۆلای بابا (مابیرف) تۆم دی • (ماریوس) چۆ دواوەو دەستی دەباخەڵێ ناو پێنج فرانكو شازدە (سوی) تێدا بوو ، گوتی : ئەو وردە بەشی ئەو ڕۆم دەگاو بۆ بەیانیش خواگەورەیە-پێنج فرانکەکەی دا بەکچەکەو کچەکە زۆر بە خۆشییەوە وەری گرت • ئنجا کۆڵوانەکەی بەشانداداو خوا حافیزی کردو گوتی : ئێستا فریای باوکم دەکەوم • لە ڕێگادا تووشی پارووە نانە ڕەقێك بوو گورج هەڵیگرتەوەو خستییە ناو دەمییەوەو گوتی : ئای چەند جوانە ! لەپاشان هەناسێکی هەڵێناو گوتی : ئای چەند ڕەقە ، دانی شکاندم •

## « دەست کورتی »

(ماریوس) ماوەی پێنج ساڵی تەواو بەدەست کورتیو فەقیری و هەژاری ژیا ، بەڵام هەرگیز ، بەتەواوی مەعنای ڕاستەقینەی هەژاری نەدەزانیو تاڵی نەچەشتبوو ، ئێستا حاڵی دەبێ • لەواقیعدا ئەو نەبوونی بە پیاوەوە دیبوو ، بەڵام نەی دەزانی ئافرەتی دەست کورت حاڵی چۆنە ؟ ئەگەر حاڵی ئەویشی بزانیایە ، ئەوە هەر بەتەواوی مەعنای هەژاری نە دەزانی تا حاڵی منداڵی هەژاریشی نەزانیایە ••

وەها لەعالەمی بیری خۆیدا غەرق ببوو ، ئاگای لەدراوسێکانی نەبوو • تەنیا ئێستاناڵەیان دەبیەو دەنگیان دەبیستێ • زانی کەدراوسێکانی چ ژیانێکی ناخۆشیان هەیەو چ ڕەنجێك دەکێشن‌و دەنگیان لێوە نایە • تەواوی ئەو خەڵکە ، ئەوانەی کە موحتاجی نانی شەون ، فەقیری‌و بەدبەختی ئەوانە ، ناڵەو پاڕانەوەیان ، تەواوی دەردی ئەوانە لـە کەلیمەی بێ نەواییاندا کۆدەبێتەوە • ئەو ڕۆژە تاریکە خـــەتای کێیە ؟ عـــامیلی ئەسڵی‌و بەدی هێنەری کێیە ؟ لەو کاتەدا دڵی گەرم بوو ، تەماشـایەکی دیواری دراوسێی هەژارەکەیانی کرد ، وای دەنواند کەتیشکی چـاوی بەدیوارەکەدا دەڕواو ، دەچێتە سەر ئەو هەژارانە •

هەستایە سەر پێی‌و تەماشایەکی دیوارەکەی کرد • لەنکاو چاوی بە کونێکی سێ گۆشە کەوت ، ئەگەر بچووبایە سەر گەنجینە کەو لەو کونەوە دەی توانی بڕ وانیتە ماڵی (ژوندرت)ی دراوسێیان • گوتی : وابا شە ئێستا کە پێنج فرانـکم بۆ ناردوون بزانم چ دەکەن •

چـۆ سەر گەنجینەکەو لەکونەکەوە بەنهێنی دەستی‌کرد بەتەماشا کردنی ماڵی دراوسێکەیان •

## « دانانی نەخشە »

کـــە (ماریوس) لـــە کونەکەوە تەماشا ماڵی (ژوندرت)ی کرد ، بەتووندی دەرگا کەیان کرایەوەو کچە گەورەکە وەژور کـــەوت • ( ماریوس ) سەرنجی‌دا پێڵاوی قوڕاوی پیاوانەی لەپێدابوو ، کراسێکی کۆنی لەبەردابوو ، سەعاتێك لە مەوبەر ئەوانەی پێوە نەدی‌بوو ، مەگەر لەبەر دەرگا دای نابێ بۆ ئەوەی ئەو بەزەیی پێدا بێتەوەو کە چووبێتەوە

دەر لەبەری کردبنەوە ؟ کچەکە چۆ ژورەوە هەناسێکی هاتەوە بەرو دەرگاکەی توند داخستەوە و بەڕوخۆشی هاواری کرد گوتی : ئێستا دێ !

باوکە پیرە نەخۆشەکەی سەرنجیدایەو ، بەپەشۆکاویەوە گوتی : کێی دێ ؟ ــ ئەو ئاغایە ! ــ ئاغا مرۆڤ دۆستەکە ؟ ــ بەڵێ : بۆ لای ئێمە دێ ؟ ــ بەڵێ بەعەرەبانەدێ •

باوکەکەی هەستایە سەرپێو دایکی خێسەیەکی لێکردو ، باوکی پرسی چوزانی بەعەرەبانە دێ ؟ ئەگەر وایە بۆ تۆ زوتر گەیشتیە جێ ؟ ماڵی خۆمانت نیشاندا ؟ پێت گوت : ژورەکەمان ئاخر ژورە لەدالآنەکەی سەرەوە ؟ لات وایە لیێ ناگۆڕێ ؟ لە (کلیسا) چاوت پێکەوت ؟ نامەکەی خوێندەوە ؟ چی وەلآم دایەوە ؟

کچەکە گوتی : باوکیباش سەبر بگرە ، ئێستا پێت دەڵێم : چوومە کلیسا ئەو هەر لەجێگای رۆژان دانیشتبوو ، سەلامم کردو نامەکەم دایە • خوێندیەوە گوتی : کچم لەکۆی دەژین ؟ گوتم : ئاغا خۆم لەگەڵت دێم • ووتی : هەر ناوو نیشانەی ماڵەکەم پێ بڵێ : چونکە دەبێ بچم نەختێك شت بکڕمو بەعەرەبانە بێم بۆماڵی ئێوە •

کە ناوو نیشانەی ماڵەوەم بۆ هەڵدا ، زۆر عەجایب هاتەبەر چاو ، ماوەیەك ڕاماو لەپاشان گوتی : ئیشکالی نیە هەر دێم • لە دوایدا دیم لەگەڵ کچەکەی لە (کلیسا) هاتنەدەرەوە • باوکی لەسەر خۆ لێیپرسی بەچیرا دەزانی هەر دێ ؟ گوتی : چونکە ئێستا چاوم لێ بوو عەرەبانێك هاتە خیابانی (پتیبانکریە) هەر بۆیەش بەغاردان هاتمەوە • گوتی : جا چوزانی ئەوە عەرەبانەکەی ئەوە ؟ گوتی : چونکە ڕەقەمەکەم دی • گوتی : بۆ ڕەقەمەکەی چەندە ؟ ووتی : چوار سەتو چلە • گوتی : زۆر

باشه ، دیاره کچێکی ژیری • باوکەکەی ڕەنگی ڕون بۆوەو ڕوی کردە ژنەکەی‌و گوتی : وادیارە ئەو پیاوە بەشەر دۆستە دێ ، زوو ئاگرەکە وەکوژێنە • ژنەکە تەکانی نەخوارد ، خۆی گورج مەسینێکی پڕ لەئاوی هەڵگرت‌و چوو ئاگرەکەی کوژاندەوە •

لەپاشان ڕوی کردە کچەگەورەکەی‌و گوتی : زووکە سەندەڵیەکە بشکێنە • کچەکە نەیرانی بۆچی‌وا دەڵێ ؟ هەڵنەستا ، باوکی چوو پێلاقێکی پیداداو شکاندی • لەکچەکەی پرسی ، ئەرێ هەوا ساردە ؟ گوتی : بەڵێ زۆر ساردە ، بەفر باریوەو دەبارێ •

کچە چووکەڵەکەی لەنزیك پەنجەرەکە ڕاوەستا بوو ، بەسەریدا نەڕاندو گوتی : زوو بە بچۆ شوشەی پەنجەرەکە بشکێنەو زوو بخەوە •

کچەکە بەسپاوی چوو مستێکی لێداو شوشەکەی هەڵوەریە خوار • ئافرەتەکە کە تا ئەوکاتە قسەی دەکرد لەسەرخۆ گوتی : ئەرێ ئەوە دەت هەوێ چی بکەی ؟ پیاوەکە ووتی : دەنگ مەکە ، تۆش بچۆ بخەوە • بێدەنگ بە قسەی‌کردو ئەویش چوو نووست • لەوکاتەدا لە گۆشێکی ژورەکە دەنگی گریان‌هات‌و پیاوەکە هاواری‌کرد گوتی : ئەوە چ بوو ؟ کچە چووکەڵەکە دەستە خوێناویەکەی ، کە بەشوشەی پەنجەرەکە بڕا بوو نیشانی باوکی‌داو ڕای‌کرد بۆلای دایکی‌و دەستی‌کرد بەگریان • ئەوجا نورەی دایك بوو کە هاواربکا ، نەڕاندی‌و گوتی : چاوت لێیە چ‌کارێکت کرد ؟ پیرە مەرد ئەو کارە ئەحمەقانە چ مەعنایەکیان هەیە ؟ تەماشا دەستی ئەو بەستەزمانە بکە چۆن بڕاوە ؟

کابرا لەسەرخۆ گوتی : زۆر باشتر بوو کەدەستی خۆی بڕی ، خۆم دەمزانی دەستی بریندار دەبێ ، هەر لەبەر ئەوەش بوو گوتم : شوشەکە بشکێنی • ژنەکە گوتی : چۆن ؟ بۆچی ؟ کابرا پیرە گوتی :

بێدەنگ بە ، کەس دەنگ نەکا • لەپاشان کراسەکەی خۆی دادڕی‌و دەستی کچەکەی توند پێبەست • بایێکی زۆر سـارد لەپەنجـەرە شکاوەکەوە دەهاتە ژورەوە پیاوی ڕەق دەکردەوە • کەلوە بەفر دەفڕینە ژورەوە • پیرە تەماشایەکی دەوروو بەری کردو گوتی : زۆرباشـە ، ئێستا دەتوانین بەباشی پەزێرایی لـەو پیـاوە بەشەر دۆستە بکەین • پیرە گوتی : بەڕاستی ئەو ژورەی ئێمە وەك لانە سەگ ساردە • ئەگەر ئـەو پیاوە نەیێ ! هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : تەماشا چـۆنی چـاوەڕوان کردوین ؟ خوایە ! چـەندم ئەو پوڵ دارانە دەدزێن • چـەندیان لێ بێزارم ؟ لەوکاتەدا لەدەرگایاندا • پیرە بەبەڵێ - بەڵێ ڕای کرد دەرگای کردەوەو گوتی : ئاغـا فـەرموون : پێڵاوی تۆو ئـەو کچـە جوانە لەسەرچاومان • پیرێکی موو سپی‌و کچێکی جوان وەژور کەوتن •

(ماریوس) لەوماوەدا لەکونەکەوە هەر تەماشای دەکرد • بەڕاستی ئەوەی ئەو چاوی پێکەوت‌و بەخەیاڵیدا هـات بەقـەڵەم بەیان ناکرێ • کچەکە هەمان کچ بوو ، تەنیـا تۆزێك ڕەنگی گۆڕا بوو • کڵاوێـکی ونەوشی لەسەر بوو ، کراسێکی ڕەشی لەبەردا بوو • ئەو پیرەی لە گەڵی بوو دەتگوت : (لوبلانك)ە کچە جوانەکە کەهاتە ژورەوە چوو بەستەیێکی گەورەی لەسەر مێزەکە دانا • (لوبلانك) چۆ پێشەوە گوتی : ئەو بەستە لیباس‌و گۆرەوی‌و چەند شتی تری تێدایە • (ژوندرت)ی مەکرباز خۆی کۆمکردەوەو بەپاڕانەوەوە گوتی : زۆر سپاست دەکەین : قوربان تەماشا، نە نانمان هـەیە ، نە ئاگر • ئەوکچـە بێچـارەم نەخۆشە ، تەنانەت کورسی‌یەکەشمان شکاوە ! پەرنجەرەکەمان شوشەی تێدا نیە لەو هـەوا ساردەدا ! خێزانم کەوتووە ! (لوبلانك) زۆری بەزەیی پێـداهاتەوە گوتی : ئەی ژنی بێچارە ! (ژوندرت) گوتی : ئاغا کچە چووکەکەشم

برینداره ! کچەکە ، کە گوێی لەو قسەی باوکی بوو دەستی کرد بەگریان کچە جوانەکەی (لوبلانك) گورج چۆلای و هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی . مەگری ئەی کچی بەستەزمان •

(ژوندرت)ی فێڵباز دەتگوت : ڕاست دەکا گوتی : بەڵێ بڕوانە چۆن خوێنی لێ دەتکێ ! فەقیرە درومانی دەکردو ڕۆژی شەش شایی بۆ خۆی پەیدا دەکرد ، بەڵام ئاوای بەسەرهات ، لام وایە دەبێ دەستەکەی وەبڕێ ، دەبێ تاماوە بەدبەخت بێ • (لوبلانك) لەولاوە گوتی : خوا نە خواستە • توخوا بەراستە ؟ کچەکە وەی زانی باوکی ڕاست دەکا بەگریانەوە خۆی دەپاڵ دایکی هاویشت • (ژوندرت) زۆر بەوردی سەرنجی دەدایە ـ (لوبلانك)و لای وابوو دەی ناسی • چوو بۆلای ژنەکەی و گوتی : باشی تێفکرە !

ئنجا هاتەوە لای کابرا پیرەو بەگریانەوە گوتی : ئاغا بڕوانە لیباسم لەبەردا نیە ، کراسی خێزانەکەم لەبەر کردووە لەو سەرمایەدا ، چونکە کۆتیشم نیە ناتوانم لەماڵ بچمەدەرەوە • گوتی : سەرباری ئەوەش بەیانی چواری مانگی (فەوریە)یەو دەبێ کرێ خانوو بدەین ، ئەگینا دەرمان دەکەن و بێ پەناو پەسیو دەبێ لەبەر باوو باران وەمێنین • گوتی : ئاغا ئەوە یەك ساڵە کرێ خانوومان نەداوە ، شێصت (فرانك) قەرز دارین • بەئاشکرا درۆی دەکرد ، چونکە شەش مانگ بوو هاتبوونە ئەو خانووەو دو مانگەکەی ئەووەڵ (ماریوس) کرێکەی بۆ دابوون • (لوبلانك) پێنج فرانکی لەباخەڵ دەرهێناو لەسەر مێزەکەی دانان ، باڵتۆکەشی داکەندو لەسەر کورسی یە شکاوەکەی داناو گوتی : (ژوندرت) ئێستا هەر ئەو پێنج فرانکەم پێن ، بەڵام لەدوا ئەوەی کچەکەم بردەوە ماڵی ، دوبارە شەو دێمەوە ، گوتی : بۆ دەبێ ئەو شۆ کرێ خانوەکە

بدەن ؟ (ژوندرت) گەش بۆوەو گوتی : بەڵێ قوربان دەبێ سەعات هەشت بیدەین • (لوبلانك) گوتی : من سەعات شەش دێم‌و شێصت فرانـکتان بۆ دێنم • دەستی کچەکەی گرت‌و خواحافیزی کرد • لەوکاتەدا کچەکەورەکەی (ژوندرت) چاوی بەباڵتۆکــە کــەوت‌و گوتی : ئاغا باڵتۆکــەت لەبیر چوو • (لوبلانك) گەڕایەوە ، بەپێکەنینەوە گوتی : لەقەستی بۆ باوکم داناوە ، لەبیرم نەچـــووە • (ژوندرت) بە پاڕانەوەوە گوتی : با تا لای عەرەبانەکە لە خزمەتتدا بێم ؟ (لوبلانك) ووتی : ئەگەر ویستت بچیـــە دەرێ ئەو باڵتۆیە لە بەر کە هــەوا زۆر ساردە •• (ژوندرت) گورجێك باڵتۆکەی لەبەر کردو هەرسێکیان چــوونە دەرەوە •• ئێوارەی رۆژی دوایی (ماریوس) چۆ سەر دۆڵابی حاجەت‌و لەکونەکەوە دەستی کردەوە بە ڕوانین لەماڵی (ژوندرت) • وەزعی ماڵەکەیان زۆر هەژارانە دەهــاتە بەرچاو ، مۆمێك لە مۆمدانێکی تەنەکەدا دایسا • کورەخانەکەیان پڕ بوو لەخەڵووزی سەنگ • میلە ئاسنێك لەناو خەڵوزی کورەخانەکەدا ڕاکشا بوو ، سور ببۆوە ، ژورکەی ڕوناك کردبۆوە • (ژوندرت) سەبیلەکـەی ئاگر دابوو بە توندی مژی لێ دەدان • ژنەکەی لەسەرخۆ دەی دواند ، لە نکاوێك ســەری بەرزکردەوە گوتی : دەزانی چی ؟ دەبێ دوو کورسی پەیدا بـکەین بۆ لەسەر دانیشتن • (ماریوس) بەوەڵامی ژنەکە پشتی شکا کە گوتی : دەچم لە ژوری ئەو پیاوە دوو کورسی دێنم • پیرێژن هـــەر هەستاو دەرگای کردەوە گورج گەیە دالانەکە ، ژورەکانیان ئەوەندە لێك نزیك‌بوون ( ماریوس ) فریا ئەوە نەکەوت بێتە خوارەوەو خــۆی وەشاری • دەستگرەی دەرگــای ژورەکەی سوڕاو دەرگا کرایەوە • بەڵام باش‌بوو ژورەکـــەی تاریك بوو ، لەڕاستی خــۆی پشتی کردە دیوارەکەو هەستی لەخۆی بڕی • ژنە بێ ئەوەی سەر بەرزکاتەوە دوو کورسی هەڵـگرت‌و چۆوە • (ماریوس) گورج ســەری بەکونەکەوە

نایەوە • دیتی ژنە کورسی یەکانی دا بە (ژوندرت)و لەتەنیشت مێزەکـە دایناو میلە ئاسنەکەی وەرگێڕاو هەستا چوو بۆلای ئەو تەنافەی کە لە قوڕنێـکی ژورەکە بوو دەیگوت : خـــەریکی تاقی کردنەوەی شتێکە • داهاتەوە تەماشایەکی ئەو شتانەی کرد کە لە پشتی دەرگاکـــە حـازر کرابوون • لەپاشان چوو سەبیلەکەی فتکردو دانیشت • چەکمەجـەی مێزەکەی ڕاکێشا چەقۆیەکی لێ هێنایە دەر ، مشتوماڵی کردو خستیەوە شوێنی خـــۆی •

(ماریوس) گــــەڕایەوە بۆ مەنزڵەکەیو چوو بێ دەنگ لەســەر جێگاکەی دانیشت ، کەس هەستی پێنەکرد • سەعات نزیکەی پێنجو نیو بوو ، هــەر بیری لە کردەوە جەریمەکانی ئەو ماڵە دەکردەوە ، بــەڵام نەدەترسا • لە نــکاوێك گوێی لەدەنــگی گەورەی ناخۆشی (ژوندرت)بوو بەکچەکانی ووت بچنە خوارەوە چاوەڕوان بن • (ماریوس) کـــە ئەوەی دی زۆر ناڕەحەت بوو ، دەستی برد دەماچەکەی لەباخەڵ دەرهێناوهێنایە سەر پێ • (ژوندرت) لەو دیو گوێی لەچرکـــەی هێنانە ســـەر پێی دەماچەکـــە بوو ، گورج ڕاپەڕیو هاواری کرد ئەوە کێیـــە ؟ لێرە ؟ (ماریوس) هەستی لەخۆی بڕی • (ژوندرت) ماوەیەك گوێی هەڵخستو لەپاشان لەقاقای پێکەنینیدادا و گوتی : ئای من چەند ئەحمەقم : ئەوە دەنگی ئەو تیغە دیوارە بوو • لەوکاتەدا لە دورەوە دەنــگی ناقوسێك شەش جار لێدا ، سەعات شەشی ڕاگەیاند • هـــەموو جارێك (ژوندرت) ســـەری ڕادەوەشاندو ، ئاخر جار هەستا شەمعەکەی کوژاندەوەو دەستی کــــرد بەگەڕان لەژورەکەداو ، لەبن لێوەوە دەیگوت : هەر دێ •

لەپاشان چوو لە سەرکورسی دانیشت • لەنــکاو دەرگا کرایــەوە ، ژنەکــەی دەرگاکەی کردەوەو لە ساڵۆنەکە ڕاوەستاو بەنەهێنی ئیشارێکی

بۆ مێردەکەی کردو گوتی : فەرموو : وەرە ژوورەوە • (ژوندرت) فەوری هەستایە سەر پێو گوتی : فەرموو ئاغا (لوبلانك) وەژوور کـــەوتو بێ ئەوەی دەنگ بـکا چوار سکە پارەی لەسەر مێزەکە داناو گوتی : ئاغـای (ژوندرت) ئەوە بەشی کرێ خانوەکەو هێندێ شتی تریش دەکاو بۆ باقیش فکرێك دەکەین • لەکاتێکدا (ژوندرت) خۆی گەیاندە لای ژنەکەی گوتی: خوا پاداشتت بداتەوە • لەپاشان سەری بردە بن گوێی ژنەکەی‌و بەدزی پێی گوت : بچۆ کـــابرای عـــەرەبانەچی مەرەخـەستکە با بڕوا ڕانەوەستێ • لەپاش دوو دەقیقە هاتەوە سەری لەقاند وەك بلێ ڕۆیشت وابوو • لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژە بەفر زۆر باری‌بوو ، دنیای پڕکردبوو ، دەنـگی هات‌و چۆی عەرەبانە نە دەهات • (لوبلانك) لەسەر کورسی‌یەك دانیشت‌و (ژوندرت)یش لەبەرامبەری دانیشت •

(لوبلانك) دوا ئەوەی لەسەر کورسی دانیشت سـەری وەرگێڕاو تەماشا جێگای کچە دەست بریندارەکەی کردو گوتی : کچە کە چۆنە؟ ( ژوندرت ) بەزەردە خەندەوە گوتی : حـالی زۆر خـەراپە ، خوشکی بردویە تی بۆ لای دوکتۆر دەستی دەرمان بکا ، ئێستا دەگەڕێنەوە •

## « قوڕنەی تاریك »

خانمی (ژوندرت) لەبەر دەرگا ڕاوەستابوو ، ئاگاداری دەکردو بەچاوێـکی ئاگرینەوە دە (لوبلانك) ڕامابوو (لوبلانك) ڕوی تێـکردو گوتی : وادیارە باشتر بووە ؟ (ژوندرت) گورج وەلامی دایەوە ووتی : قوربان زۆر بەشەهامەتە ئەگینا ئەوا دەمرێ • لەوکاتەدا ( مـاریوس ) کەمێك ڕوی وەرگێڕا ، پیاوێك لەگۆشەی ژوورەکە ڕاوەستابوو ، تازە هـــاتبۆ ژوورەوە ، وا بەسپاوی هاتبـــوو هـەستیان پێ نەکردبوو •

ئارەق‌گیرێکی کۆنی بێ کراس لەبەردابوو ، دەستی پڕ بوون لە خاڵی کوتراو ، وێنەی ڕەش بوو • بەهاتنە ژورەوەی ، هەر وەك (ماریوس) کەوتە دوو دڵیەوە ؟ (لوبلانك)یشی خستە مەترسی‌یەوە • پرسی ئەو پیاوە کێیە ؟ (ژوندرت) لەسەرخۆ دوگمەی باڵتۆکەی داخست‌و گوتی : گوێی مەدەیە ، ئەوە دراوسیمانە • لەپاشان هەستا ئەنیشکی خستە سەر مێزەکەو گوتی : وێنەیەك دەفرۆشم • لەوکاتەدا بەهێواشی دەرگاکرایەوە زەلامێکی‌تر وەژور کەوت‌و لای کابرای پێشوو دانیشت ، تۆڵی ڕوت‌بوو ، بەمەرەکەب ڕوی خۆی ڕەش کردبوو •

(ژوندرت) وەدەنگ هات - ووتی : موبالات بەوانە مەکە ، ئەوانە خزمن • ئەوەی گوت‌و هەستا تابلۆیەك بەدیوارەوە سەرەوبن هەڵاوەسرابوو هەڵیکێرایەوە • بەڵام لەبەر ئەوەی (ژوندرت) لە ڕاستی کونەکە بوو (ماریوس) نەی زانی چی لێ نووسرا بوو ؟ ( لوبلانك ) گوتی : ئەوە چیە ؟ ووتی : ئەوە ئوستادێکی گەورە وێنەی گرتووە ، لەبەر ئەوەی بەسەرهاتێك لەدڵی مندازیندو دەکاتەوە ، وەك کچەکانم خۆش دەوێ ، بەڵام لەبەر هەژاری دەیفرۆشم : کاتێ (لوبلانك) ئاوڕوی دایەوە چوار زەلام لەژورەوە بوون ، قۆڵ‌ڕوت‌و ناوچاوان ڕەش ، لەعاستی خۆیان نەدەجوولان • (ژوندرت) حاڵی بوو کە (لوبلانك) سەیریان دەکا گوتی : ئەوانە لەخۆمانن لەبەر ئەوەی لە کارخانەی خەڵوز کار دەکەن ئاوارەش بوون • (لوبلانك) وەك لە حاڵی دیفاعدا بێ دە (ژوندرت) ڕامابوو • گوتی : ئەو تابلۆیە هەر سێ (فرانك) دێنی • ئنجا هەستا پشتی بەدیوارەکەوەدا تەماشای دەورو بەری خۆی کرد • (ژوندرت) لەلای چەپی‌و ژن‌و چوار زەلامەکەش لەلای ڕاستی بوونو ڕێگای دەرگاو پەنجەرەکەیان گرتبوو • ( ژوندرت ) دەستی کردەوە

بەشکایەت لەوەزعی خۆی ، پیـاو وەی دەزانی ڕاست دەکا ، خێـری پێدەشێ و لەبەر هەژاری شێت بووە • (لوبلانك) چـاوی تێوە بڕی بوو • (ماریوس) نەکونەکەوە دانی بەخۆیدا گرتبوو ، سـەیری دەکردن • لەنـکاو (ژوندرت) هـاتە پێشەوە ، وەك هەور ئرماندی گوتی : ئیتر پێویست ناکا ، تۆ من دەناسی •

دەرگای ژوورەکە لەنـکاو کرایەوە ، سێ نەفەری چاکەت ئاوی ، ڕوبۆشی کـاغەزی ڕەشیان پۆشی بوو ، وەژور کەوتن و دەرگاکـە داخرایەوە • یەکەمیان شیشە ئاسنێکی بەدەستەوە بوو • دووەمیان زۆر بەخـۆوە بوو ، ساتۆرێـکی بەدەستەوە بوو • سێیەمیان چـوار شانەیەکی کورتە بالا بوو ، کلیلێکی گەورەی بەدەستەوە بوو • دیـار بوو (ژوندرت) دەمێك بوو چاوەڕوانی دەکردن ، چونکە لەگەڵ ئاسن بەدەستەکەیان ئیشارەیان بۆ یەکتر کرد • لەپاشان ڕوی کردە (لوبلانك) بەپێـکەنینەوە گوتی : منت ناسی ؟ (لوبلانك) پشـتی بەدیوارەوە ناو بەوردی تەماشای دەکرد گوتی : نە خەیر ؟ (ژوندرت) چـوو بۆلای مێزەکـەو لەمۆمەکە نزیك بۆوە دەتگوت : وەلاغە ئاوسـاریان لەسـەر داڕنیوە ، وەك ئینسانێکی وەحشی نەڕاندی گوتی : من ناوم (ژوندرت) نیـە ؟ ناوم ( تناردیە )یە • چـای چی شاری (مونتفرمیل)م ! حـاڵی بووی ؟ ئیستا دەم ناسی ؟ (لوبلانك) تۆزێك سور هەڵگەڕاو لەسـەرخۆ گوتی : نەخەیر لەجـاران زیاتر نات ناسم ؟ گوتی : بەڵێ مـن ناوم (تناردیە)یە ، لەترسی خاوەن قەرزان ناوی خـۆم گۆڕیوە • ئیستا ناسی مت ؟ (ماریوس) بەگوێی لێ بوونی ئەو کارەساتە دەستی کرد بەلەرزین و دەستی توند لەدیوارەکـە قایم کرد ، تا نەکـەوێتـە خوارەوە ، بەڵام دەماچەکەی لە دەست بەر بۆوە ، چونکە ئەو (تناردیە)ی کە (لوبلانك)

ئەی دەناسی هەمیشە لەدڵی ئەودا بوو • وەسیەتەکەی باوکی هاتەوە یاد
کە نووسی بوی مرۆڤێك بەناوی (تاردیە) گیانی منی رزگار کرد •
دەبێ کورەکەم هەر چی لەدەستی بێ بۆی بکا • ئەو پیاوەی کە زۆر
لەمێژبوو (ماریوس) بۆی دەگەڕا تەنانەت ناوەکەی زۆر لا پیرۆز بوو ،
باوکی لەشەڕی (واترلو) نەجات دابوو ، لەشەیتان چاکتر نەبوو ،
خەریکی جینایەتکردن بوو ! لەوکاتەدا کوێی لەدەنگی باوکی بوو،
کە لە قوڵای گۆڕدا دەیگوت : (ماریوس) چیت لە دەست دێ بۆو
پیاوە بیکە •

(ماریوس) چوار ساڵی تەواو بوو بەدوایدا دەگەڕا بۆ ئەوەی
قەرزەکەی باوکی بداتەوە • لەو کاتە ناسکەدا کە ئەو دەیویست
بەرگری لەو کردەوە ناشیرینە بکا ، دڵی دەیگوت : ئەوە (تاردیە)یە
باوکی تۆی لەمەرگ رزگار کرد ، ئەو تا ئەو کاتە هەمیشە ئارەزوی
ئەوە بوو (تاردیە) ببینێو خۆی باوێتە بەر پێیان ! بەڵام بەچاو پێکەوتنی
ئەو دیمەنە گۆڕا ، دەیویست ئارەزووەکەی لە بەر پێیاندا وردو هار
بکاو (تاردیە) لەبەین بەرێ ! لە حەیبەتان دەلەرزی • هەموو شتێك
پەیوەندی بەوەوە بوو • گیانی ئەو پیاو خەراپانە لەدەستی ئەودا بوو •
ئەگەر دەماچەی وەکار بخستایە (لوبلانك)ی رزگار دەکرد ، بەڵام
(تاردیە) لەبەین دەچوو • ئەگەر تەقەشی نەکردایە ، ئەوە (لوبلانك)
دەبوو بەقوربانی هەوەسی گڵاوی ئەوان و لەوانەش بوو تاوانبار خۆی
دەرباز بکا •

( تناردیە ) دەیگوت : هەنگی لەداردا دیوەتەوە ، بەدەوری
مێزەکە دا هەڵدەسوڕاو بە (لوبلانك)ی دەگوت : بزانە ئاغای بەشەر
دۆست ، ئاخری وەبەر دەستانم کەوتی : ئاغای میلیونلەر ، ئاغای

بەخشندە ! کەدەتگوت : تۆ ناناسم ؟ ئەوە تۆ بووی بەیانیان دەهــــاتیە چاخانەکەمان لەشاری (مونتفرمیل) • هەشت ساڵ لەمەوبەر ، لەساڵی ۱۸۲۳ دا بوو • کەوتەوە یادت ؟

ئەوە تۆ بووی کە (کەزیە)ی کچی (فانتین)ت لەماڵی ئێمە دزی • بەڵێ بولبولت دزی ، تۆ دەست بڕو فێڵ بازی • هەر کە پێت نایە ئــەو ماڵەوە تۆم ناسیەوە ، فێڵبازی منداڵ دز ! بەو وێنە پاکەتەوە •

(لوبلانك) گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو تا بێدەنگ بوو ، گوتی : من لێت حاڵی بووم : تۆ منت بەیەکێ‌تر لێ گۆڕاوە ، من ئەو نیم ، زۆرم لاسەیرە کەبەمن دەڵێی : دەوڵەمــــەند ؟ مــــن تۆ ناناسم • (تناردیە) بەتووندی نەڕاندی‌و گوتی : ئاخ پیری خەڵەفاو ! ئێستاش دەستت لــەو قومار بازیە هەڵنەگرتووە ؟ دەڵێی هیچم لەیاد نیەو نات‌ناسم ! (لوبلانك) زۆر لەسەر خۆ گوتی : ئاغا داوای لێ بوردن دەکەم : بەڵام وادیارە تۆ جەردەی • ــ ڕێگری ؟ بەڵێ دەزانم ئێمە بەڕێگرو جەردە ناو دەبەن ، ئێوەی دەوڵەمەند ! بەڵێ ڕاستە من قەرز دارم ڕام‌کردووە ، نانی شەوێم نیە ، پارەم نیە بۆیە جەردەو ڕێــگرم ، ئاغای (میلیون)لەر مــــن کاسب بووم ، کارتی کەسابەتم هەبوو ، ماڵیاتم دەدا ، بەڵێ • بەڵام تۆچی ؟

(تناردیە) چوو بۆلای پیاوەکــانی لای دەرگاکەو گوتی : ئــــەو کابرایە وە دەزانی نۆکەری ویم ، وام قسە لەگەڵ دەکا ! لەپاشان چاوی دە (لوبلانك)ەوە بڕی‌و لەســــەرخۆ گوتی : دەڵێی چــی ؟ (لوبلانك) وەڵامی نەدایەوە •

(تناردیە) چاوی سور هەڵگەڕا بوون لە ژورەکەدا هات‌و چــــۆی دەکرد • بــــە ژنەکــــەیەوە (نۆ)کەس بوون • (تناردیە) پشتی‌کردە

( لوبلانك )و ڕوی کردە پیاوەکان • لەوکاتەدا ( لوبلانك ) بەفرسەتی زانی فڕکەی کردە سەر پەنجەرەکەو خەریك بوو خۆی فڕیدا ، لەپاشەوەڕا توند گرتیانو ڕایان کێشایەوە ژورەوە • بەهەموانیان تێی بەر بوون ، چواری ڕووپۆشداریش لە ڕاڕەوەکەوە هاتن بۆ یارمەتیان • یەکیان تێلایەکی بەدەستەوە بوو خەریك بوو لەسەری (لوبلانك)ی ڕاکێشی • (ماریوس) کەئەوەی دی ، خۆی بۆ ڕانەگیراو گوتی : باوکە بمبەخشە ! دەستی لەسەر بەلەپیتکەی دەماچەکەی داناو خەریك بوو دەستی لێ بکێشێ ( تناردیە ) بەدەنگی بەرز گوتی : وازی لێ بێنن • بەڵام لەوکاتەدا (لوبلانك) کەوەهۆش هاتبۆوە ، بەهەموو هێزی خۆی مستێکی لەسینگی یەکیان ڕاکێشاو بەپشتدا خستی • ئنجا بەهەر دوو پشتە دەستانی دو کۆڵە مستی لەدووی‌تر دا • هەریەکە بەلایەکدا کەوتن • چوارەکانی‌تر لە پاشەوەڕا توند دەستیان گرت ، بەڵام پیرە بەپێلەقە دووانی تری لە عەرزێداو دووەکانی دی توند لەناو لاقان گرتو ڕای گوشین ، وای تین بۆهێنان هاواریان دەکرد • دەتگوت : لەناو دوو بەرداش دان • زۆری نەخایاند بەهەموانیان سواری سەری بوونو گرتیان دەتگوت : بەرازیان گرتووە ، لەعەرزێیانداو دەستیان کرد بە باخەڵ گەڕانی ، کیسە باخەڵێکی چەرم شەش (فرانکی)تێدا بوو لەگەڵ دەسرێك ، لە باخەڵیان دەر هێنا • (تناردیە) دەسرەکەی هەڵگرتو چوو گوریسێکی هێنا بۆپیاوەکانی هاویشت – گوتی : توند وەی بەستن• بەستیانەوە • (تناردیە) چوو لەبەرامبەری دانیشت گوتی : ئاغا ئاغا تۆ کارێکی زۆر خەراپت کرد کە دەتویست لە پەنجەرەکەوە ڕابکەی ، چونکە لەوانە بوو قاچت بشکێ ، ئنجا گوتی : گوێبگرە هەرچی گوتم : دەبێ بینوسی • چوو قەڵەمو کاغەزی هێناو گوتی : هابنووسە • (لوبلانك) وەدەنگ هات گوتی : بەدەستی بەستراو چ بنووسم ؟

(تناردیه) ئاخێکی هەڵــکێشاو گوتی : ڕاست دەکـــەی ببوورە ، دا دەستیبکەنەوە • تێــــلاً بەدەستەکە هــــات دەستی ڕاستی کردەوە •

(تناردیه) خێرا قەڵەمەکەی دە مەرەکەب هەڵکێشاو گوتی : هـــا ئەوەی پێت دەڵێم بینوســـــە • (لوبلانك) قەڵەمەکەی لێ وەرگرت : گوتی : بنوسە کچم لەگــەڵ هەڵــگری نامە وەرە ، چونــکە زۆرم کـــار پێی چـــاوەڕانتم : ( لوبلانك ) بە پەشۆکاویەوە بە ناچاری چی پێ گوت : نووسی • (تناردیه) گوتی : زۆرباشە ئیمزای بــکە ناوت چیە ؟ گوتی : ناوم (اوربین‌فابر)ە • (تناردیه) وەك پشیلەی بەهەڵمەت دەسرەکــەی دەرهێناو گوتی : بەڵێ : (اــف) ڕاستە کـــەواتە بە پێتی (الف•ف) ئیمزای بــکە • ناچار ئیمزای‌کرد • (تناردیه) گوتی : چونـــکە دەبێ بەدوو دەست وەنوشتێ بیدە بەمن • دای بەوی نوشتاندیەوە • ئنجـــا گوتی : ها ها لەپشتی پاکەتەکە ڕەقەمو ئادرەسی ماڵی خۆتان بنووسە • نووسی مادموازل فـــابر • مەنزڵی مسیو اوربین‌فابر • خیـــابانی دومینیك ژمارە (١٧) • (تناردیه) بە پێکەنینەوە بانــگی ژنەکەی کردو گوتی : ئەو نامە بــگرە • خۆت دەزانی چی لێ دەکـــەی ؟ بەعەرەبانە بڕۆو لەگەڵ ئەو کچە زوو وەرەوە •

ژنەکە دوو نەفەری لەگەڵ خۆی بردوو ڕۆیشت • بە (تناردیه)وە شەش کــەس لەوێ مانەوە • بێ دەنــگی بۆ ماوەیەك باڵی بەســـەر ژوورەکەدا هێنا • (تناردیه) لەفکراندا غەرق ببوو • (لوبلانك) جووڵەی نەدەکرد • (ماریوس) لە کونەکەوە سەیری دەکرد • ژنەکە هاتەوە ، هەناسە بڕکەی وێ کەوتبوو ، ڕەنــگی سور هەڵگەڕابوو ، چـــــاوی دەرپەڕی بوون • بەهەر دوو دەست بەئەژنۆی خـــۆیدا دادا گوتی : نیشانەکەی بە غەڵەت دابوو ! کەس لەوێ نەبوو ! تەنانەت لەخیـــابانی

ســـان دومینیکو لەژمارە حەقدەدا کەسێك بەناوی مسیو (اوربین‌فابر)
کەس نەی دەناسی • (ماریوس) لەخۆشیان گەشکەی گرت ، چونـــکە
(اورسولا)یان وەك ئەوان دەڵێن : بولبول ، لەوێ نەبوو ، لـەو خەتەرە
رزگاری بوو • (تناردیە) لە سەرمێزەکە دانیشت ، ماوەیەك بێدەنـگ
بوو • بەچاوێـکی تورەیەوە دەکورەخانەکەوە فـــکری‌و ئاخـــری
ڕوی‌کردە (لوبلانك) گوتی : ناوو نیشانەی پێچەوانە ! بەو پیلانە چیت
لەبن‌سەریەوە بوو ؟ (لوبلانك) ووتی : دەمویست کـــاتێکی موناسیبم
دەست‌کەوێ • تەکانێکی توندی دایەخۆو کوریسی دەستەکانی پچڕاند •
تا ئەوان پێیان زانی خۆی‌گەیاندە ئاگردانەکە • داهاتەوە دەسکی شیشە
ئاسنە سور بۆوەکـــەی گرت‌و ڕاست بۆوە ، ئاسنەکـــە ئـەوەندە
سوربۆوە تینەکەی ناوچاوانی پیاوی دەسوتاند • هەمویان لەجێـــگای
خۆیان وشك بوون جوولەیان نەکرد • بەدەنـگی بەرز وەك هـــەور
گرماندی گوتی : ئێوە شایانی ڕەحم پێ‌کردنن ، بەڵام ژیانی مـــن تازە
ئەوە ناهێنێ دیفاعی لێ‌بکەم • ئێوە لاتان وابوو من وەحشەت دەمگرێ ،
دەتان ویست بەزۆر قسەم پێ‌بکەن‌و ئەوەی پێم خۆش نەبوو بەزۆر پێم
بنوسن ، زۆر بێ‌عەقڵ بوون • هـــەر فەقیانەکەی هەڵدایەوەو گوتی :
تەماشا کـــەن •

ئاسنە سور بۆوەکەی بە باسکی چەپی خۆیەوە ناو قرچەی سوتانی
پێست‌و گۆشت‌و ، بۆنی سوتانیان وولاتی پڕ کرد • ( ماریوس ) لـەبن
کونەکە دەستی کرد بەلەرزین‌و لەترسان پەشۆکا •

کابراکانیش ئێوە لەرزیان هـــاتێ‌و مووی بەدەنیان گرژ بوون ،
بەڵام بۆ خۆی یەك مسقاڵ تێك نەچوو • لەو کاتەدا کە ئاسنی سوربۆوە
پێست‌و گۆشتی دەسوتاندو دوکەڵ بەرز دەبۆوەو برینەکـــەی قوڵتر

دەبوو ، بە ڕوویەکی گەشەوە ڕوی کردە (تناردیە)و لەسەر خۆ گوتی :
بەدبەختینە ، وامەزانن من گیای ئێوەم ! لەپاشان ئاسنەکەی لەبرینەکە
دەرهێناو لەپەنجەرەکەوە تووڕی هەڵدایە ناو بەفرەوە • ئنجا گوتی :
باشە ئێستا چتان پێخۆشە لەگەڵم بکەن • (تناردیە) گوتی : بیگرن •
دویان چوون شانیان گرتو ، یەکی تێلا بەدەستی دەمو چاو داپۆشراو
هات لە پشتیەوە ڕاوەستا تا ئەگەر گوتیان لە سەری ڕاکێشێو بیکوژێ •
(ماریوس) گوێی لە (تناردیە)و ژنەکەی بوو بەسرکەوە قسەیان دەکرد ،
دەیانگوت : هەر ڕێگایەك ماوە • (تناردیە) بەهێواشی چوو چەکمەجەی
هەڵدایەوەو کێردێکی تیژی دەرهێنا • (ماریوس) چاوێکی بەدەوروو
بەری خوێدا گێڕا • لەو کاتەدا کارەساتێکی زۆر سەیر ڕویداەلەنکاوێك
دەنگێك لەلای دەرگای ژورەکەوە هات گوتی : شەوتان باش • ئاو
ڕویان دایەوە ئامیر مەفرەزەی پۆلیس (ژاور) بەزەردە خەندەوە
وەژور کەوت •

## « ڕزگار بوون »

(ژاور) لە ئەنگۆرێرا پۆلیسەکانی دامەزراندبوو ، خۆشی لەناو
دارەکانی قەراغ خیابانی (باریەگوبلین)دا ، کە لەبەرامبەری عیمارەتی
(گوربیو) بوو حەشاردابوو ، سەرنجی دەدا • ئەو شەوە لەهاتو چۆی
عەرەبانەیەك کەوتە شکەوە کە بە زۆری دەچۆ ئەو بینایە • بەتایبەتی
کە ماوەیەك بوو لەو ناوە لە ون بووەکەی خۆی دەگەڕاو ئەو شەوە
زانی ئەو چەند کەسە چوونە وێ ، زیاتر کەوتە گومانەوەو گوتی :
بابچم بزانم چ خەبەرە ؟ کاتێ وەژور کەوت دار حەیزەرانێکی دەابن
هەنگلێدا بوو ، شێریکی بە بەرەوە بوو ، هات ڕاوەستاو نەڕاندی ـ

لەجێی خۆتان نەبزون ، پازدە پۆلیسم لەگەڵە بیناکەش چوار دەوری گیراوە • چەند پۆلیسی شیر بەدەستو دوو سێ دەرەجەدار لـــە دوا وی وەژور کەوتنو گورج بە ئەمری (ژاور) هـــەمویان باڵ بـەست کردن !

ژنەکەی (تاردیە) خۆی لەخۆڵێ وەرداو بەگریانەوە دەیگوت : ئای کچەکانم ! کچـــە بێچارەکـانم ! لەوکاتەدا ( ژاور ) چـــاوی بەئەسیرەکەیان کەوت ، بەڵام لەبەر ئەوەی ژورەکە زۆر ڕوناك نەبوو نەی ناسی ، گوتی : دەستی ئەو ئاغایەی بکەنەوە ، بەڵام نەهێڵن کـەس بڕوا • لـە پاشان ( ژاور ) چوو لە پشتمێزەکە دانیشت پۆلیسێك هـات دەستی (لوبلانك)ی کردەوە • (ژاور) کاغەزێـکی لەباخەڵ دەرهێناو دەستی کرد بە تەحقیقات • لەپاش نووسینی چـــەند دێڕ ســـەری بەرزکردەوەو گوتی : ئەو ئاغایەی ئەسیریان کردبوو بێهێننە پێشەوە ، گەورەکانو پۆلیسەکان تەمـــاشا یەکی ئەملاو ئـەولای خۆیانکرد • (ژاور) گوتی : باشە چ بوو ؟

پیرە مەردە موو سپیەکە کە ئەسیرەکە بوو ناوی (لوبلانك) مسیو اورابینفابر • باوکی (اورسولا) ، یان باوکی بولبولی ون بوبوو •

## « چاو پێك کەوتنی دوو خۆشەویست »

ماریوس ئاگـــای لـە تەواوی ئەو کارەساتو پەلاماوو دانە بوو • لەپاش ئەوەی (ژاور) هەمووی لەگـەڵ خۆی بردن • (ماریوس) هاتە دەرو ڕۆیشت سەعات نۆی شەو بوو ، یەکسەرە چۆ ماڵی (کورفیراك)ی دۆستی لە خیابانی (لاوریە) • بەیانی ڕۆژی دوایی سەعات حـــەوت

هاتەوە ، کرێ خـــانوو حەقی خانمی (بورگن)یداو شتـــەکانی خستە عەرەبانێکەوەو باری کرد • (بورگن)ی خزمەت چی زۆری لا ســـەیر بوو گوتی : دیارە لەگرتنی دزەکان ترساوە • بەخوای گەنجێکی ترسە نۆکە ؟ ئـەی دڵ بزنی ، سیفەت کچ ! ئـــەو لەبەر دوو شت ڕۆیی ، یەکەم ترسا ، دووەم لەترسی ئەوەی مەبادا بۆ شاهیدی لەکانی دادگـــا کردنیاندا بانـــگی بـکەن • حاڵەتێکی وای بە سەردا هـــاتبوو باس نەدەکرا • بۆ ماوەی چەند لەحزە چاوی بەخۆشەویستە کەی کەوتبوو، باوکە پیرەکەی دی‌بوو • لەو دنیاپانو بەرینەدا کەسی لەوان خۆشـــتر نەدەویست • هەوڵی دەدا پارێزگاریان بـکا • ئێستا وەك پەڵەهەورێك لەئاسمانەوە فکری‌بماڵی ، ئێستا بەتەواوی گۆڕاوە • تازە دەیزانی ناوی خۆشەویستەکەی (اورسولا)یە • زانی کە ئەو باوکە پیرە سەر سپیەی دڵ ڕوناك‌و سەخی‌و شەریف‌و بەشەهامەتە • (ماریوس) لە پێش ئەوەدا بچێتە ماڵی (کورفی‌راك) لەباغی بولبولدا دەژیا • بە ئادرەسی (بولوارد) دولاسانتە ، درەختی حەوتەم ـ خیابانی کرولبارب زوربەی کـات لەوێ ڕای دەبوارد • ئەو ڕۆژە زوو لەوێ ڕۆیشت ، چوو لەســـەر جۆگـــە ئاوێك دانیشت • تیشکی ڕۆژ لەسەر پەلك‌و گـــەڵای دارەکـــان دەدرەوشایەوە • ( ماریوس ) بیری لێ دەکردەوە • تازە توانای کـــار کردنی نەمابوو ، حەوسەلەی نوسینی نەبوو • لەدنیای خەون‌و خەیاڵدا دەژیا ، ورەی بەر دابوو ، سەعات بەسەعات دڵی تاریك‌تر دەبوو ، ئیتر ڕۆژیشی نە دەدی •

نە دەی‌توانی دەردی دڵی خۆی بـکا ؟ نە لە بیر خۆی بەریتەوە• لەسەر لێوە جۆگایەکە دانیشتبوو ، گوێی لە تەقەو ، ڕمبەو ، زرینـگەی شیوو کوڵی ژنی گەڕەکی (گوبلین) گرتبوو ، دەنـگی ئەو باڵدارانەشی

دەبیست کە لەناو لەخ و گەڵای دارەکانی سەر سەریدا هێلانەیان کرد بوو ، هەڵ نیشتبوون و ورتەیان دەهات •

لەلایەك نەغمەی ئازادیو خۆش بەختیو لەلایەکیتر بیری رەنجو بەدبەختی تۆزێك هەستیان جووڵاند بوو • لە چڵە پۆپەی ئەو شەوقەدا دەنگی ئاشنایەکی هاتە بەر گوێ دەیگوت : ئاخ ، لێرەیە ! کە سەری هەڵبڕی کچەگەورەکەی (تناردیە)بوو کە جارێك پێنج فرانکی دابویەو ناوی ایبونینە • لاوازترو شێواوترو بێخـواسو ڕوت بوو ، بەڵام لەجاران جوانتر • هات لەبەرامبەری ڕاوەستاو گوتی : ئەی ئاخـری تۆم دۆزیەوە ، زۆرت بە دوادا گـەڕام ، نازانی ئەوە دوو هـەفتەیە لەبەندیخانەم ؟ بەر بووم • گوتی : دەزانم تۆش لەبەر ئەو کارەساتە لەوێ ڕۆیشتی ، ئێستا لە کوێی ؟ درێژەی پێداو گوتی : ئاخ خـۆ کراسەکەت دڕاوە ، بێنە با بۆت وەدروم • (ماریوس) وەڵامی نەدایەوە• لەپاشان کچەکـە گوتی : من دەتوانم تۆ خۆشحاڵ بکەم • گوتی : چۆن ؟ ئەو قسە مەعنـای چیـە ؟ هەناسێکی قووڵی هـەڵکێشاو ووتی : (ماریوس) تۆ جاران زۆر لەگەڵم میهرەبانتر بووی ، گوتی : ددیباشـە مەبزوورت چیە ؟ (ابونین) گازێـکی لەلیباسەکـەی گرتو کـەوتە گومانەوەو ئاخـری گوتی : بەڵێنم بدەیە پێ بـکەنی ؟ پێم خۆشـە ڕوو خۆشو شادبی • خۆ تۆ بەڵێنت دابو چی داوابکەم بێ دڵیم نەکـەی • گوتی : باشە بەڵام قسە بـکە بزانم •

ابونین تێەوە ڕاماو گوتی : دەزانم لە کوێیە • (ماریوس) ڕەنگی سپی بوو کەوتە دڵە کوتـکەو گوتی : چوزانی ؟ کام نیشانە ؟ گوتی : ئەوەی داوات لێ کردم ، ئەو ئادرەسەی کـەخۆت باشتر دەزانی • ئەوەی کە هەمیشە بە دوایدا دەگەڕایو پیاسەت دەکرد • هەمیشە مـن

چاوم بەدوادا دەگێڕای • (ماریوس) کەوتە منجە منجو زمانی لاڵبوو گوتی : ئادرەسی ئەو ئافرەتە ؟ (اپونین) هەناسێکی هەڵکێشاو (ماریوس) هەستا دەستی گرتو بەخۆیەوە گوشیو گوتی : ئاخ • زووکـە نیشانم بدە ، قسە بکە • هەرچی دڵت ئارەزوو دەکا ئامادەم ! ئـەو نیشانە لــە کوێیـــــە ؟

گوتی : وەرە لەگـەڵم • خیـابانو ژمـارەی خانووەکەیان بەباشی نازانم ، بەڵام دەزانم کەلەو نزیـکا نەیە • خانووەکە دەناسمەوە وەرە لە گەڵم • چەند هەنگاوێك ڕۆیشتن اپونین ڕاوەستا گوتی : زۆر لـــە نزیـکی من دەڕۆی ، ئەوە جوان نیە بامن لەپێشەوە بڕۆم تۆ وەدوام کەوە • وەك ڕێبوارێك • ئاخر بۆ گەنجێکی وەك تۆ جوان نیـە لەگەڵ ئافرەتێکی وەك من بیینن •

## « خانوێکی نەهێنی »

لە ناوەڕاستی سەدەی دوایدا ، یەکێك لەئەندامـــانی پارلەمانی (پاریس) قەسرێکی هاوینی لە فور برگ سن ژرمن دا لە لای خیـابانە وێرانەکەی (پلومە دروستکرد ، دوو قات بوو ، باغێکی گەورەی لەبەر دەمدا بوو • دەروازەگەورە کەی بۆ خیابان دەکرایەوە • باغەکـــــە دەهەزار مەتری چوار گۆشە دە بوو • پیاوی ڕێڕەو هەر ئەوەندەی لێ دەزانی ، بەڵام لەو دیو خانووەکە حەوشێکی بچووك بوو ، لە ئاخریەوە لەلای (سانجرمان) خانوێـکی بچووکی نزم دیار بوو دوو ژوورو ژێر خانێك بوو ، چۆڵ بوو ، دو دەرگای بوو ، دەرگـــایەکی ئاشکراو ، لەپاشەوەش دەرگایێکی نەهێنی بوو ، دواوەی دالانێـــکی دورو درێژ بوو ، لە وێوە دەچۆ دەرگایەکی‌ترو بەقادرمێکدا دەچویە سەرخیابان •

لە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی (١٨٢٩)دا پیاوێکی بە ساڵدا چوو ، چوو ئەو خانوە چۆڵەی بەکرێ گرتو دەستێکی پێدا هێناو چوٚ ناوی بەخۆیو کچێك بەناوی (کەزیە)وەو بێوەژنێك بە ناوی (توسان) کە لەنەخۆشخانەو فەقیری رزگاری کردبوو خزمەتی خۆیانی پێ دەکرد • ئەو پیاوە پیرە هەمان (ژانواڵژان)بوو ناوی خۆی نابوو فۆشلفان • یان (فۆشلونت) • بێگومان خوێنەرەکان دەزانن کە (ژانواڵژان)و باوکە (مادلن)و فۆشلونت و (لوبلانك) هەر یەکێکە ، بەڵام بۆچی کلیسای (پتیپیکوس)ی بەجێ هێشتو چی ڕوی دابوو ؟ هیچ • بەڵام هەر وەك لەبەشەکانی پێشودا باسمانکرد ( ژانواڵژان ) لە کلیسادا بەخۆشی ڕای دەبوارد • چاوی لە (کەزیە)بوو ، وای دەزانی هیچ شتێك ناتوانێ لەیەکیان دور خاتەوە مەگەر مردن ؟ بەڵام زۆری نەخایاند (ژانواڵژان) پەی بە ئاڵۆزیەك برد ، لەخۆی پرسی : ئایا لەبەر خاتری ئاسودەیی خۆم ، ئەوە خەیانەتو دزی نیە کە خۆشیو ژیانی ئەو کچە لەو کلیسایەدا لە بەین بچێ ؟ ئەویش حەقی ژیانی نیە ؟ ئەگەر بوو بە ڕاهیبە تفوو لەعنەتی من نا کا ؟ ئاخری بریاری دا کلیسا بەجێ بێڵێ، لەهەلێك دەگەڕا • تا باغەوانە پیرەکە مرد • (ژانواڵژان) چوٚ لای مودیری کلیساو گوتی:چونکە کاکم کەمێکی میرات بۆ بەجێ هێشتووەو دەتوانم بەئاسانی پێی بژیم ، هەروەها لە بەر ئەوەش کە ماوەی پێنج ساڵە (کەزیە) لێرە دەخوێنی پێنج هەزار فرانك بۆ کلیسا دادەنێم • مودیرە ئیجازەی دانو کلیسایان بەجێ هێشت • بەڵام سندۆقەڵێکی هەڵگرت ، هەمیشە لای خۆی دای دەناو کلیلەکەشی هەر بەخۆی بوو •

لەپاش ماوەیەك ئەو خانوەی بەکرێ گرتو چوونە ناوی ، ناوی خۆی نا اولتیموس فوشلونت لەهەمانکاتیشدا دوو خانوی تری بەکرێ

کرتبوو ، بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستیدا بچنە وێ • خانوەکان هەریەکەیان لە کەرەکێك بوون • جارو بار (کەزیە)ی دەبرد یەك دوو مانگ دەچوونە ناویان ، بەڵام (توسین)یان نە دەبرد •

(کەزیە)و خزمەت کارەکە هەر لە قەسرە کۆنەکەدا دەبوون ، بەڵام ئەو لەژووری پشتی حەوشەکەدا دەنووست • ژوورەکەی بەرپێك و تەختێك و مێزێك و دوو کورسییە شڕو تۆزێك و چەند بەرك کتیب لە گەل سندۆقە بچوکەکەی خۆی تێدا بوو • هەر لە گەل (کەزیە) نانی دەخوارد • دەستی دەگرت و دەچوون بۆ کەڕان ، دەچوون بۆ کلیسای (سن ژاك) دوعایان دەکردو خێری دەکرد ، دەچوو لە چاڵاوێك خۆی ئاوی دێنا • لەڕاستیدا (فوشلونت) ئەندامی کاردی میللی بوو (ژانوالژان) لەخزمەتی عەسکەری ڕزکاری نەبوو بوو ، ساڵی دوو سێ جار دەچوو لیباسی نیگابانانی لەبەر دەکردو بۆ شوێنە وونی وەزیفەکەی دەبینی ، زۆریشی پێ خۆش بوو ، چونکە بەو هۆیەوە دەچۆ ناو خەڵك •

تەمەنی لەشێست ساڵ تێ پەری بوو ، بەڵام دەتگوت : پەنجا ساڵە • خۆیان لەخەڵك ئاشکرا نەدەکرد ، تەنانەت خزمەتی باغی حەوشەکەشیان نەدەکرد ، تا خەڵك شکیان نەباتە سەر • سندۆقی بەریدیان لابوو ، قەت کاغەزێکیان تێ نەداویشت •

## « گۆڕانی وێنە »

کاتێ (کەزیە) کلیسای بەجێ هێشت تەمەنی چواردە ساڵ و شتێك بوو • خوێندنی ئاینی تەواو کردبوو • (کەزیە) دایکی خۆی نەدی بوو ، هەر چەند (ژانوالژان) زۆری خۆش دەویست ، بەڵام جێگای

دایکی بۆ نەدەگرتەوە • ئەو منداڵی خۆی وەبیر نەدەهات ، وەك خەون دەهاتەوە خەیاڵی کە چۆتە لای بیشەڵانێك و (ژانواڵژان) بردویەتیەوە • رۆژێك گوتی : باوکە لەخەومدا دایکم دوو باڵی گەورەی بوو ، رەنگە پاشیەیەکی گەورە بووبێ ؟ ( ژانواڵژان ) گوتی : بەڵێ رەنجی زۆر کێشا • رۆژێك (کەزیە) دەئاوینەی روانیو بەخۆی گوت : عەجایب ! خۆی زۆرجوان هاتە بەر چاوو زۆری پێخۆش بوو • تا ئەوکاتە خۆی وا بەجوانی نەدیبوو • هەر لای وابوو کچی ناو ماڵەو جوان نەبووە • بەڵام (ژانواڵژان) ئەوەی پێناخۆش بوو •

(کەزیە) ئەو شەوە کە چۆ سەر جێگا خەوی لێ نەکەوت دەیگوت : بەراستی زۆرخۆش دەبوو جوان بوومایە !

ئنجا ئەو کچە جوانانەی کەوتەوە یاد کە لە کلیسادا هاورێی بوونو گوتی : ئۆخەی ! دیارە وەك (سوشاون)ی هاورێم جوان بووم ! بەشەو لەپاش نان خواردن کەمێکی درومان دەکرد • شەوێك لەکاتی درومان کردندا سەری هەڵبڕی باوکی زۆر سەیر تەماشای دەکرد • جارێکیدی بەخیاباندا دەرۆیی گوێی لەکورێك بوو لە دوایەوە دەیگوت : بەراستی جوانە • بەڵام حەیف بەرگی جوانی لەبەردا نیە • رۆژێکیتر لەناو باغەکەدا پیاسەی دەکرد ، گوێی لە (توسنت)ی خزمەت کاریان بوو بە (ژانواڵژان)ی دەگوت : ئاغا دەزانی (کەزیە) زۆر جوان بووە ؟ کە ئەوەی بیست گورج چۆ ژورەوەو خۆی گەیاندە بەر ئاوێنە ، لای سەیر بوو • خۆ بەجوان ناسین • جاریوایە وەك لەسەرماو هەورێکی سەختدا رۆژت لێ دەرکەوێ وایە •

بەڵام (ژانواڵژان) بەجوان بوونی (کەزیە) هەستی بەترسێك دەکرد • چونکە دەیزانی جوانبوونی (کەزیە) پەردەیەك بەسەر

ئارەزووەکانی ئەودا دێنیو گۆڕانێك بەسەر ئەو ژیانە خۆشەیاندا دێ •
ئەو ئەو هەموو ڕەنجو زەحمەتو ناڕەحەتیەی لەبەر (کەزیە) کێشـــا بوو • لـە هـــەوەڵدا شـــەیتانێك بوو ، ئێستا قەشەیە ، تەنیـا ئارەزوی ئەوەبوو (کەزیە)ی لەبەر چاو بێو (کەزیە) خۆشی بوێ !

هەر دەیگوت : کچەکەم چەند جوانبووە ، دەبێ ئاخـــری چی بەسەر بێ ؟ لێرەدا جیـــاوازی بەینی خۆشـــەویستی دایكو یەکیتر دەردەکەوێ ، ئەوەی (ژانوالژان) پێی ناڕەحەت بوو ، ئەگەر دایکێك بەکچەکەی خۆیەوە ببینێ زۆری پێخۆشی دەبێ •

(کەزیە) لەو ڕۆژەوە کە تەماشا ئاوێنەکەی کردو لای وابوو جوان بووە زیاتر موبالاتی بەجلو بەرگ دەکرد • هەناسەی دوا ڕۆژ لەدڵیدا گەشەی کردبوو • یەکێك لەو دوو گەوهەرانەی پایەی ژیانی ئافرەت پێك دێنن : جێی خۆی لە دڵی (کەزیە)دا کردبۆوە • دیارە گەوهەری دووەمیان عیشقە • چونـکە ئیمانی بەجوانی خۆی هێنابوو ، هـــەستی ژنانە لەدەرونیدا پەرەی ستاند بوو ، ڕقی لەجلو بەرگەکەی جـارانی هەڵدەستا • لەماوەی کەمتر لە مانگێكدا نەك هەر بوو بە جـوانترین ئافرەتی ئـــەو ناوچـــەیە ؟ بەڵـکو بوو بەشیك پۆشترینی ئافرەتانی (پاریس) یەکەم ڕۆژ کەکراسی تازەو کلاوی سپی لەسەرکردو دەستی (ژانوالژان)ی گرتبوو ، چون بۆگەڕان دەتگوت : یەکـــەم گوڵی نەورۆزە ، ئەوەندە گەشو دەم بەپێکەنین بوو گوتی : باوکـــە وێنەی منت پێچۆنە ؟ (ژانوالژان) وەك حەســـوودی پێبەرێ ووتی : زۆر دڵڕفێنە • دیار بوو پێی ناخۆش بوو (کەزیە) ئاوا خۆی گۆڕیوە • کە گەڕانـــەوە گوتی : (کەزیە) وادیارە تازە جلەکانی جارانت ناپۆشی ؟ گوتی : ئەو جلو بەرگە کۆنە چیە ؟ خەڵك گاڵتەم پێدەکا • بۆ باوکـــە

تازە دەت هەویّ چ بکەم ؟ هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : تازە قــەت ئەو جۆرە لیباسە دەبەر ناکەم • (ژانوالژان) ئاهێکی درێژی هەڵـکێشاو دەنـگی نەکرد • تا ئەوکـــاتە (کەزیە) کەم وەدەر دەکەوت ، بەڵام ئێستا زۆری کەیف لەگەڕانە • لەڕاستیدا فائیدە لە ناوچاوانی دڵڕفێنەرو جل‌و بەرگی شیکدا چیە ؟ ئەگەر نیشان نە درێن ؟

## « سەرەتای جەنك »

لەپاش تێپەڕ بوونی شەش مانگ دوبارە (کەزیە)و (ماریوس) لـە شۆینی گەڕان ـ (لوکزامبورك) چاویان بەیەکتر کەوتەوە •

(کـــەزیە) و (ماریوس) لەبڵێسەی ئاگری عیشقدا دەسووتان • دەستی قەزاو قەدەر زۆر لەسەر خۆ ئەو دووەی لێك نزیك دەکردەوە • رۆژ لەدوا رۆژ ئاگری دەرونی ئەوانی زیاتر خۆش دەکرد • لەو چاو پێکەوتنەدا تیری خۆشەویستی (ماریوس) لە دڵی (کەزیە) هەڵچەقی‌و (ماریوس)یش پەی پێ‌برد کە خۆشەویستی کاری کردۆتە سەر هەستی (کـــەزیە) • تا ماوەیەك وەك تەواوی کچان لەکاتێکدا بــــە ئاشکرا دەشوێنێکەوە ڕادەماو ، لەبنەوە سەیری (ماریوس)ی دەکرد • یەکـــەم رۆژ کەئەو دووانە چاویان بەیەکتر کەوت ، هەر دوکیـــان هەستیان بەوەکرد کە یەکەم نیگای بەو جۆرە ناوی عیشقەو زمانی نیگا بە نەهێنی زۆر قسەو ڕازو نیاز دەکاو دەردی دڵ زۆر دەر دەبڕیّ !

ئەو رۆژە (کەزیە) چـــۆ خانوەکەی خیابانی (اورست) کـــە (ژانوالژان) بریاری‌دابوو ناو بەناو بچێتە ویّ • (کەزیە) لەبەر ئەوەی لەجوانی خۆی گەی‌بوو ، خۆی بەخاوەن چەك‌و خاوەن دەســـەڵات‌و بەقووەت دەزانی • لەیادمانە کە (ماریوس) جاران چۆن دوو دڵ دەبوو،

چەند سەعات لە گەردشگاکەدا دادەنیشتو تواناى هەستانو چوونە پێشەوەى نەدەکردو چۆن (کەزیە) ڕقی لێ هەڵدەستا •

ڕۆژێك (کەزیە) بە (ژانوالژان)ى گوت : باوکە وەرە با تاوێك لەولایە پیاسەیەك بکەین • (کەزیە) بۆیە دەچۆ وێ ، چونکە دەى دى کە (ماریوس) لەو نزیکە دوور ناکەوێتەوە •

ئەو ڕۆژە نیگا سیحراوییەکەى ، (ماریوس)ى دیوانەکردو ئاگاى لە خۆى نەما • نیگاى (ماریوس)یش (کەزیە)ى خستە دڵە کوتکێو لەرزین • لەپاشان (ماریوس) بەخاتر جەمى ڕۆیشتو (کەزیە) بەنیگەرانیەوە مایەوە • لەو ڕۆژە بە دواوە یەکتریان دەپەرست (کەزیە) مەعناى کەلیمەى عیشقی نە دەزانى ، چونکە قەت لاى ئەو ئەو کەلیمە باس نەکرابوو • بەوهۆیەوە نەى دەزانى چ ناوێك لەوهەستە بنێ ؟

ئایا کەمێك ناوى خۆشى خۆى نەزانێ لە نەخۆش کەمترە ؟ نەى دەزانى ئەو هەستە چاکە یان خەراپە ؟ سوودى هەیە یان زیان ؟ زەرورییە ، یان ڕێکەوتە ؟ هەمیشەییە ، یان کاتی ؟ دروستە ، یان قەدەغەیە ؟

ئەوعیشقە سوودى بۆ ڕوحی (کەزیە) زۆربوو ، چونکە ئەو پێویستی بەخۆشەویستی بوو • دەى ویست یەکێك بپەرستیو خۆشی بوێ ، هەموو ڕۆژێ زۆر بەپەلە لەکاتی دیاریکراودا دەچوو گەردشگاو (ماریوس)ى دەدیو زۆر کەیف خۆش دەبوو • ڕۆژێك خۆى بۆ ڕانەگیراو ڕازى دڵى خۆى لەژێر پەردەدا بە (ژانوالژان) گوت : ــ گوتی : ئەوباغەى (لوکزامبورك) چەند جوانە • (ماریوس) و ( کەزیە ) لەگەڵ یەك وەك غەریبە وابوون ، قسەیان پێکەوە نەدەکرد ،

لێك تریك نەدەبوونەوە ، وەك ئەستێرەکانی ئاسمان لێك‌دوور بوون ، تەنیا دەژیان‌و یەکتریان دەبینی .

## « پەژارە »

هەموو وەزع‌و حاڵەتێ ئەندازەی خۆی هەیە . دایکی پیرو ئەبەدی سروشت و تەبیعەت زۆر بەخێواشی (ژان‌واڵژان)ی لەکاری (ماریوس) ئاگادارکرد . بەوهۆیەوە ڕەگ‌و دەماری ( ژان‌واڵژان ) کەوتنە لێدان‌و دەلەرزین‌و فکری گۆڕا . هەروەها (ماریوس)یش کەوتە خۆو ، بەگوێرەی یاسای گەورەی خواو بەهۆی سەمانی دایکی تەبیعەتەوە ، ئەوەی لەتوانایدابوو ، لەدەستی دەهات بۆ خۆشاردنەوە لەباوکی (کەزیە) دەی‌کرد .

بەڵام (ژان‌واڵژان) هەر چەند سەرنجی دەدایە ڕەفتاری ، تەبیعی نەدەهاتە بەرچاو . وەك جاران نەدەچۆڵایان‌و زۆر دوور دادەنیشت . بەزاهیری کتێبێکی بەدەستەوە دەگرت‌و خەریکی موتاڵای دەبوو . جاران بەکۆتە کۆنێکەوە دەهاتە شوێن گەڕانەکە ، بەڵام ئێستا هەر ڕۆژە کۆتێکی نوێ لەبەردەکا . (ژان‌واڵژان) زۆری لێ بەست بوو . بەتایبەتی سەلیقەی (ماریوس) لەپۆشینی کۆتی تازەداو لەلەبەر کردنی ئەو کراسە جوانە بەنرخانەی (کەزیە) بە تەواوی ئەویان نیگەران‌و ناڕەحەت کردبوو . قەت باسی (ماریوس)ی لای (کەزیە) نەدەکرد . تەنیا ڕۆژێك نەبێ خۆی بۆ ڕانەگیراو گوتی : ئاخ تەماشا ئەو گەنجە بکە وێنەیێکی چۆنی هەیە ؟ پیاو ناڕەحەت دەکا ، ئەوەندە خۆی دەگرێ . ئەگەر (ژان‌واڵژان) ئەوەی ساڵێك لەمەوبەر بگوتایە:(کەزیە) لەبەر ئەوەی منداڵ بوو ، لەوەڵامدا دەیگوت : نەء . گەنجێکی زۆر

سەرنج ڕاکێشە • ئەگەر دە ساڵ لەمەو دوا بیگوتایە دەیگوت : ڕاست دەکەی زۆر دزێوە ، نایەتە بەرچاو • لەبەر ئەوەی خۆشەویستی ئەوی لەدڵ چەقی‌بوو ، بەڵام ئێستا لەوکاتەدا زۆر لەسەر خۆ گوتی : کامە ؟ ئەوگەنجە دەڵێی ؟

دەتگوت : ئەوە یەکەم جارە ئەو کوڕە دەبینێ • (ژانواڵژان) لە قسەکەی خۆی پەشیما بۆوە گوتی : تەماشا من چەند بێ عەقڵم ؟ دیارە ئەو بێچارە ئەوکوڕەی نەدیوە ؟ من خۆم نیشانم دا •

(کەزیە) ئەنیا کەڕەتێك لەدەمی دەرچوو قسێکی درکاند بوو بەهۆی سەرسامی باوکی • باوکی سێ سەعات بوو لەگەڵ ( کەزیە ) دانیشتبوو ، خەریك بوو هەستێ ، (کەزیە) گوتی : باوکە وا زوو ؟

(ژانواڵژان) نەی دەتوانێ کارێکی وابکا (کەزیە)تێی نەگا • تەواوی ئەو چەند سەعاتە کە لەژیانی دوو دڵداری خۆشەویستدا زۆر خۆش ، بەتایبەتی کاتێ (کەزیە) لەبەوە زەردە خەنەدەی بۆ ( ماریوس ) دەکردو (ماریوس) وەی نەدەزانی ناو چاوانە فریشتەییەکەی (کەزیە) نەبێ هیچ لەو دنیا پان‌و بەرینەدا هەیەو هەر ئەوی دەدی • (ژانواڵژان) بە چاوێکی سەیر لە (کەزیە)ی دەڕوانی‌و بەچاو پێکەوتنی (ماریوس) زۆر توڕە دەبوو • (ماریوس) ئارامی لێ هەڵگیرا بوو ، ڕۆژێك تا خیابانی (لواووست) وەدوا (کەزیە) کەوت • ڕۆژی دوایی چوو لەخاوەن خانوەکەی پرسی ، خاوەن خانو چۆ لای (ژانواڵژان) و گوتی : ئاغا ئەو کوڕە گەنجە بۆچی ئەوەندە لە تێوە دەپرسی ؟

(ژانواڵژان) ڕۆژی دوایی بەچاوی پڕ لەرقەوە ڕوانیە (ماریوس)و (ماریوس) هەستی پێ‌کرد • (ژانواڵژان) باری کردەوە بۆ

قەسرەکەی خیابانی (پلومە) • (کەزیە) هەر چەند پێی ناخۆش بوو ، بەلاّم وەسەر خۆی نەهێناو نەی‌گوت : بۆ بار دەکەی ؟ (ژان‌والژان) لەبەر ئەوەی خۆی دەردی عیشقی نەدی‌بوو ، پەی بەدەردی دلّی (کەزیە) نەدەبرد • هەر ئەوەندەی دەزانی کە (کەزیە) ناڕەحەت‌و غەمبار دێتە بەر چاو • تا رۆژێك لە (کەزیە)ی پرسی گوتی : پێت خۆشە بچینە گەردشگای (لوکزامبورك) ؟ (کەزیە) بە ناڕەحەتیەوە گوتی • نەخەیر !

(ژان‌والژان) بەکزی (کەزیە) زۆر ناڕەحەت بوو • (کەزیە) بۆیە وای وەلاّمی باوکی دایەوە ، لای وابوو کە هەستی ژنانەی خۆی بەو شێوە دەر ببڕێ‌و وا نیشان بدا کە چوون‌و نەچوونی لا وەك یەك بێ ، باوکی جارێکی‌تر پێی دەلێتەوە •

بەلاّم چەند مانگ تێ پەڕین تا چوونەوە گەردشگاو زۆر درەنگ ببوو • (ماریوس) لەوێ نەما بوو • زۆری پەرۆش بوو ، رۆژ بەرۆژ پەرێشانتر دەبوو ، نەی دەزانی زستانە ، یان پاییزە ، هەتاوە ، یان باران دەباری ، هەورە ، یان ساوە ؟ تەیر دەخوێنن ، یان نا ؟ نە بیری لەهیچ دەکردەوە ، نە هیچی دەدی • تەنیا ئەوەی دەزانی چاو دەجێگایەکەوە ببڕی • لەگەلّ ئەوەشدا هەر کارێکی‌وای نە دەکرد کە (ژان‌والژان) بە تەواوی تێی بگا • ئەوباوك‌و فرزەندە کەتا دوێنێ یەکتریان زۆر خۆش دەویست ، ئێستاخەفەت لەیەکتر دەخۆن ، بەلاّم وەسەر خۆیان ناهێنن‌و باسی ناکەن •

## « برینی دەروو شیفای ژوور »

ئیتر ( کەزیە ) و (ژان‌والژان) خویان‌دابۆ نان‌دان بەبرسیان‌و

جل‌کردن بۆ ڕوت‌و هەزارانو دڵی خـــۆیان بەوە خۆش کرد بوو •
غەمیان لەدڵدا نەدەما •

ڕۆژێك بەجووتە چوونە عەیادەتی (ژوندرت) کـانێ گــەڕانەوە (ژانواڵژان) چۆ کاولە خانوەکەی پشتی حەوشەکەوەو باڵی ڕوت‌کردە (کەزیە) تەماشای کرد برینێکی گەورەی قووڵی بەقۆڵەوەیە دەتگوت : سووتاوە ڕەش بۆتەوە ، مـــاوەی مانگێك لەجێدا بۆی کەوت ، بەهیچ جۆرێ ڕازی نە دەبوو دوکتوری بۆبانگ کەن ، دەیگوت : پیویستیم بەدوکتۆر نیە ، بەڵام (کەزیە) وەك کچێکی زۆر دڵسۆز شـەوو ڕۆژ دەرمانی دەکرد • زۆریشی پێ خۆش بوو کە دەتوانێ خزمەتی بــکا •

(ژانواڵژان) خـــۆی لەجاران بەخۆش بەخت‌تر دەزانی کـــە (کەزیە) ئاوا بەڕوخۆشی خزمەتی دەکا • جار جـــار لـە (کەزیە)ی دەڕوانیو دەیگوت : ئاخ برینی باش ! ئاخ دڵی میهرەبان ! ( کەزیە ) بەهۆی نەخۆشی باوکیەوە نەدەچۆ دەرەوە ، هەر لەماڵ دەبوو ، کتێبی بۆ باوکی دەخوێنـــدەوە • (ژانواڵژان) لەخۆشیانی وەی دەزانی تازە لەدایك بووە ، کوڕە گەنجەکەو گەردشکای (لوگزامبورك)ی لەبیرچوو بوونەوە • (کەزیە)ش هاتبۆوە سەرخۆ • (ژانواڵژان) بەخۆی دەگوت: بەڵێ من لەئەووەڵەوە بەسەهو چووم ، وانەبوو •

ئەوەندەی خـــــۆ بەخۆش بەخت دەزانی خێڵی ( تـــاردیە )و شەڕەکەی لەبیرچوو بۆوە ، هەر لەوان دەترساو ، بەڵام دەیگوت : تازە ئەوان لەبەندیخانەدانو لەدوا ڕۆژیشدا ناتوانن هیچ بکەن • دەیگوت : بەڵام بەڕاستی عائیلێکی بەد بەختن ؟

بەهار داهات • باغو دەشت‌و گوڵزار ئەوەندە جوان بوون • ڕۆی

کرده (کەزیە)و گوتی : ئەوە بۆ ناچیـە ناوباغو پیاسەیەك ناکـەی ؟ زۆرم پێخۆشە • (کەزیە) بێ دڵی نەکردو چۆ ناو باغ دەستی کرد بـە قـەدەم لێــدان •

برینی باوکی وردە وردە سارێژ بۆوە • (کـەزیە) زۆری پێ خۆش بوو • مانـگی (مارس)بوو ، زستان بارگەی پێچابۆوە ، غـەمو پەژارەی بارکردبوو ، دنیا دنیایەکی‌تر بوو •

مانـگی (نیسان) داهات • لەو مانگەدا رۆژ بەئاسمانەوە تیشـکی زۆر خۆشە ، هەر وەك منداڵی ساوا دەگری ، درەختو باغو گوڵو مێرك و مێرغوزار شێوەی سەر زەوی دەگۆڕن • (کەزیە) زۆرجـوان بوو ، بەتایبەتی بەهاران غەم لەدڵاندا کەم دەبێو زوربەی خەڵك زۆر وایە دەگۆڕێ • (کەزیە)ش فەرقی کردبوو •

سەعات دەی بەیانی دوا نانخواردن باوکی هەڵنا ، کە لەگـەڵی بچێ بۆ گەڕان ، باڵی باوکی گرتو وردە وردە وەدەر کەوتن • بـای بەهار غونچە گوڵی ماچ دەکردنو هەوا زۆر فێنك بوو • ( کــەزیە ) ئەوەندە کەیف خۆش بوو ، ئاگای لەخۆی نەبوو ، بە ئارەزوی خـۆی پێ دەکەنی • (ژانواڵژان) زۆری پێخۆش بوو ، وەی دەزانی گوڵی پایزی ، بەهاری لێ هاتووە • برینی باسکی گۆشتە زونەی هێنابۆوەو شەوانە دە چوو دەگەڕاو پیاسەی دەکرد •

## « دڵیك لەبن بەردێکدا »

ژانواڵژان) عادەتی وابوو ، جار جار دوو سێ رۆژ دەچـوو بۆ سەفەر ، لەمانـگی (نیسان)ی ئەو ساڵەدا خوا حافیزی لە (کەزیە) کردو

بە کارەکەرەکەی گوت : ئاگات لە (کەزیە) بێ •

لە باغەکەدا ، لەنزیك دەروازە کونکونەکە کە دەیڕوانیە سەر خیابان سەکۆیەکی بەردین بوو ، بەری تەماشا کردنی چاوی خەڵکی بێکارەی گرتبوو کە بەقەستی تەماشا ناو باغ بکەن ، مەگەر لە قەڵشتی دەروازەوە تەماشایان بکردایە • لەو مانگی نیسانەدا (ژانوالژان) رۆژێك چۆ دەرەوە و (کەزیە) لە دوا رۆژ ئاوا بوون چوو لەسەر ئەو سەکۆیە دانیشت • لەدوا ماوەیەك هەستا لە ناو باغەکەدا دەستی کرد بەگەڕانو دوبارە هاتەوە سەر سەکۆیەکە • کە تەماشای کرد بەردێك لەسەر جێگاکەی دانراوە ، کەلەپێشدا لەوێ نەبوو • زۆری لاسەیر بوو دەیگوت : دەبێ ئەو بەردە مەعنای چبێ ؟ کێ لەوێی دانابێ ؟ چۆن هاتبێتە ژورەوە ؟ مەگەر لەقەڵشتی شیشە ئاسنەکانی دەروازەکەوە دەستی هێنابێتە ژورەوە ؟ ئاوڕێکی دایەوەو بەترسەوە چۆوە ژورەوە ، دەرگای ساڵۆنەکەی توند داخستو قفڵیدا • ئنجا لە خزمەت کارەکەی پرسی گوتی : باوکم هاتۆتەوە ؟ ووتی : نەخەیر • (کەزیە) گوتی : ئەی تۆ هەمیشە دەرگاو پەنجەرە دادەخەی ؟ بە تایبەتی کێلونی دەروازەکە قایم دەکەی ؟ گوتی : بەڵێ مەترسە • (کەزیە) باشی دەزانی کە ئەو خزمەت کارەیان قەت خیانەت ناکا ، بەڵام لەوە دەترسا چونکە خانوەکەیان لە ئاوەدانی زۆر دوور بوو • خزمەت کارەکە گوتی : ڕاست دەکەی دەبێ زۆر وریا بین • بەتایبەتی خۆئاغاش لە گەڵ ئێمە لێرە ناخەوی ، بەڵام هیچ مەترسە ، تەواوی دەرگاو پەنجەرەم داخستووە دەڵێی قەڵاتی قایمە • (کەزیە) گوتی : بێ دەنگ بەو هەموو پەنجەرەکان قایم کە • (کەزیە) بەقسەکانی خزمەتکارەکە واتێك چوو تەنانەت توانای ئەوەشی نەبوو بڵێ : بچۆ تەماشا ئەو بەردە بکە کە

لەسەر سەکۆکەیە • لەوە دەترسا کەدەروازەکە بکاتەوە یەکێك بێتە ژورەوە • هەرچەند دەرگاو پەنجەرە داخرابوون ، بەڵام خزمەتکارەکەی وادار کرد بچی هەموو کونو قوژبنی خانوەکە بگەڕێ لەدوایە (کەزیە) چۆ ژورەکەی‌و سەرنجی ژێو قەرەوێلەکەی داو ئەو شەوە زۆر بەناڕەحەتی نووست • لە گەڵ گەردی بەیانی خاسیەتی ڕۆژ بوونەوە ئەوەیە ، کە خەو لەپیاو دەزڕێنێ‌و ، خەندە دێنێتە سەر لێوان • هەر کە ڕۆژ بۆوە (کەزیە) شەوی ڕابردوی کەوتەوە یادو بەشەرمەندەییەوە گوتی : ئەیا ڕۆ ، ئەوە چ خەونێکم دی ؟

تیشکی ڕۆژ کەلە درزی پەنجەرەوە دەهاتە ژورو سێبەری پەردەکانی ئەرخەوانی ڕەنگ دەکرد ، (کەزیە)ی وا گەشاندەوە کارەساتی شەوی ڕابردوی لەبیر بردەوەو بەخۆی گوت : خۆ سەر سەکۆکە هیچ بەردی لێ نەبوو ، ئەوە خەون بوو دیم • لیباسی گۆڕی‌و ڕۆیی بۆ نێو باغ‌و ڕای کرد بۆلای سەکۆکە • لەناکاو هەستی بەئارەقێکی سارد کرد بە ناوچاوانیدا هاتە خوارێ ، چونکە بەردەکەی دی لەوێ بوو •

بەڵام ئەوجارە ڕوناك بوو ، وەك شەو نەترسا گوتی : ئای بابزانم ئەوە چیە ؟ بەردەکەی هەڵبری کاغەزێکی لەژێر دابوو ، گورج پاکەتەکەی هەڵپچڕی نامەکەی دەرهێنا ، زۆرجوان نوسرابوو ، بەڵام ناوو ئیمزای کەسی پێوە نەبوو ، گوتی : دەبێ بۆ کێ نووسرا بێ ؟

سەری وەرگێڕا تەماشا ئاسمان‌و خیابان‌و کۆترەکانی کرد کەلە دەورەی بەملا و ئەولادا دەفڕین‌و هاتە سەر ئەوەی وەی خۆینی • لەکاتێکدا خەریکی خوێندنەوەی نامەکە بوو ، وردە وردە بۆی ڕۆن دەبۆوە ، وای هەست دەکرد کە بەدەستێکی لەرزۆك نووسراوە • لە بەعزە

دێرێکدا مەرەکەبەکەی تۆخەو ، لەهێندێك جێدا کاڵە ، وای دەگـەیاند
کە بەچەند رۆژ ئەو نامە نووسرابێ • ئەو نامەیە پڕ بوو لە هـــەستی
عەلاقەو خۆشەویستی‌و ، ئاگری ئەوینی لێ دەباری • (کەزیە)تا ئەوکاتە
قەت شتی‌وای نەخوێندبۆوە • دەیگوت : ئەو خەتە جـوانە چیـە ؟
نامەیەکی بێ ناوو نیشان ؟ بێ ئیمزا ؟ نامەیەکی پڕ لەئەوین دەتگوت :
فریشتەیەك هێناویەتی‌و کچێك دەی خوێنێتەوە • نامەیەکی عاشـقانە ،
نووسەر تەواوی ڕازو نیازی خـۆی نووسی‌وە • جا کێ نووسیویەتی‌و
بۆ کێ نووسراوەو بۆ کێی ناردووە خوا دەزانی ؟ بەڵام (کەزیە) زوو
گوتی : دیارە خۆیەتی ، هەر ئەو کوڕەیە ! گورج بۆماڵ گـەڕایەوەو
چۆ هۆدەکەی خـۆی‌و دەرگـای لەسەرخۆی پێوەداو دەستی‌کرد
بەخوێندنەوەی نامەکە • ئەوەندەی خوێنـدەوە هەمووی لەبەرکرد •
لەپاشان ماچی کردو بەسینگیەوەنا •

ئیتر هەموو شتێك تەواو ببوو • (کەزیە) بە بەحری ئەوینـدا
چوو بۆ خوارێ • دەروازەی خۆشی لێ کرابۆوە • ئەو ڕۆژەی زۆر بە
خۆشی بردە سـەر • شەوێ (ژانوالژان) چۆ دەرەوە (کەزیە) هەستا
زولفی بەشانە کردوو ، کراسێکی ئێخە دابڕاوی لەبەرکرد ، گـەردنە
بلورینەکەی تێڕا دیار بوو • هەر بەو تاریکەشەوە چۆ ناو باغ‌و دەستی
کرد بەگەڕان‌و دەست داهێنان بە لەخەدارەکاندا • چۆ سەر سەکۆکە •
بەردەکە هەر لەوێ بوو • دانیشت‌و دەستە سپیەکانی بە بەردەکـە دا
دێنا دەتگوت : سپاسی دەکا •

لە نکاوێك موچرکێکی پێدا هات‌و ئاوڕوی دایەوە • زانی کـە
بەکێك لەو تاریکە شەوەدا لەوێیـە • هەستاو لەبەر پەشۆکاویانی بێ

دەنگ ڕاوەستا ، زۆر پەرێشان بوو ، پاشەو پاش گەڕایەوە ، پاڵی دا بە دارێکەوە دەنا دەکەوت .

لەنکاو گوێی لە دەنگی نەناسراوێكبوو ، ئەوەندە لەسەرخۆ دەهات دەتگوت : دوو پەلکە گەڵا وێك دەکەونو دەنگیان لێوە دێ . گوتی : لێم ببوورە کە لە خۆوە هاتم : ئاگــام لەخۆم نەمابوو خــۆم ڕانەدەگرت ، بۆیە هاتم . ئایا ئەوەی لێرەم دانابوو خوێندتەوە ؟ ئایا دەم ناسی ؟ ئایا لەبیرتە ئەو ڕۆژە چۆنت تەماشا کردم ؟ ڕێگام بدە جار جار بێمە ئێرە ، لەغەیبەوە پێیان گوتم : دەزانم دەمرم . تۆ فریشتەی منی . خۆزگە دەت زانی چەندم خۆش دەوێی ؟

بەڵام ببوورە ، تورە مەبە ، ئاگام لەخۆم نیە ، بوومە هۆی ناڕەحەتی تۆ . (کەزیە) لەقوڵایی دڵەوە هەناسێکی هەڵکیشاو گوتی : ئاخ دایــە گیان . لەپاشان لەجێگای خۆی دانیشت ئاگای لەخۆی نەبوو ، خەریك بوو بەلادا بکەوی ، کوڕەکە گورج هات باوەشی پێدا کردو بەخۆیەوە گوشی . (کەزیە) دەستی گرتو لەسەر دڵی دانا ، دەستی وە نامــەکە کەوت کە لەسەر دڵی دانابوو ، بەزمان لاڵیــەوە گوتی : دەڵێی منت خۆش دەوێ ؟ (کەزیە) لەسەرخۆ ووتی : خۆت دەزانی ؟ لــەپاش ماوەیەك (کەزیە) گوتی : ناوت چیە ؟ لەوەڵامدا گوتی : (ماریوس) ئەی تۆ ناوت چیە ؟ ووتی : (کەزیە) .

## « ناوو نیشانی دا بە کەزیە »

قەت ئاسمان ئاوا پڕ ئەستێرەو ، درەخت ئاوا گەشاوەو ، گوڵو گوڵزار ئاوا بۆن خۆشو ، باڵندە ئاوا بێ دەنگ نە ببوون ؟ (ماریوس)

لەتەمەنی خۆیدا ئاوا خۆشحاڵ نەببوو • بەڵام (کەزیە) زۆر غەمبـــار بوو • لێی پرسی کەزیە هۆی غەمباریەکەت چیە ؟

ووتی : باوکم ئیمرۆ گوتی : خۆت حازرکە ، لەوانەیە بچین بۆ سەفەر • (ماریوس) زۆر ناڕەحەت بوو زمانی لاڵ بوو نوتقی نەما •

(کەزیە) وەدەنگ هات گوتی : ئەوە چیە ؟ لەوەڵامـــدا ووتی : نازانم چیت ووت ؟ گوتی : بۆنازانی ؟ لەوانەیە بچین بۆ (ئینگلتەرە) • بەڵام فکرێکی باشم کردووە ! جێـــگاکەی خۆمانت پێ دەڵێم : تۆش وەرە ! گوتی : (کەزیە) ئەوە دە لێی چی ؟ من پیاوێـــکی هەژارم ، تۆ هەر بە شەو من دەبینی ، ئەگـــەر بەرۆژ چاوت پێ بـــکەم خێرم پێ دەکەی ! پارەی پەساپۆرتم لە کوێ بوو ؟

بەڵام با ناوو نیشانی خۆەت پێبڵێم : مەبادا شتێك ڕو بدا ؟ هـەر قەڵەم دادەرەکەی دەر هێناو بە تیغەکەی لـــە دیوارەکەی هـــەڵکەند ـ پلاکی شازدە ـ خیابانی (دولاوزیری) • (کەزیە) تەماشای کردو گوتی : چت لەدڵدایە پێم بڵێ ! گوتی : خوا لێکمان دور نەخـاتەوە دو بەیانی چاوەڕوانم بە •

## « بۆ کوێ دەچن »

هـەر ئەو ڕۆژە ، دەورو بەری سەعات چواری پاش نیوە ڕۆیە ، (ژانوالژان) بە تاقی تەنێ لەسەر کورسی گەردشگای ( شازدومارس ) دانیشتبوو بەبەحری فکردا چووبۆ خوارێ • ڕۆژێـکی دی لە کاتێکدا لە ناو باغو دەورەی خیابان پیاسەی دەکرد ، چاوی بەئاغای (تناردیە) کەوت • زانی کە لەزینـــدان ئازاد بووە • بەڵام لەبـــەر ئـەوەی

(ژان‌واڵژان) خۆی گۆڕی بوو ئەو نەی ناسیەوە •

سەرەڕای ئەوەش ئەو ڕۆژانە (پاریس) ئەوەندە ئارام نەبوو ، دەنگ‌و باس‌و بگرەو بەردەی سیاسی بوو بەهۆی ئەوە پۆلیس وریاتر وەبن‌و دەستیان کرد بەسەرنج دانی کارتی خەڵك •

جا لەبەر ئەوەی (ژان‌واڵژان) لەژیانیدا زۆر شتی بەنەهێنی کردبوو ، مەترسی زیاتر بوو ، نەی دەتوانی خۆی بشارێتەوەو ئاشکرا نەبێ ؟ بریاری دابوو نەك هەر لە (پاریس) • بەڵکو لە فەرەنسادا نەمێنی‌و بڕوا بۆ (ئینگلتەرە) • ڕۆژێك بە (کەزیە)ی گوت : بڕیارێکی وامداوە خۆت حازر بکە ، تا حەفتێکی کە لێرە دەڕۆین •

ئاخری ، سەرە ڕای ئەوەش ڕوداوێکی‌تر ڕوی‌دا ، ئەوەندەی دیشی تین بۆهات • ئەو ڕۆژە بەیانی زوو هەستا لەناوباغەکەدا دەستی بە پیاسەکردن کرد • ئاخری هاتە سەر تادرمەکان ، چاوی بەدێرێك کەوت لەدیوارەکە بە هەڵکەندراوی نووسرابوو • ڕەقەمی شمارە شازدە ـ خیابانی دولاوریری ئەو وتانە تازە نوسرابوون وادیاربوو ئەو شەوە نووسرا بوو • گوتی : دەبێ ئەوە مەعنای چی‌بێ ؟ ڕەمزو نیشانەیەکە بۆ خەڵك ؟ ئاگادار کردنەوەی منە ؟ هەر چی‌بێ ، دیارە یەکێك هاتۆتە ناو ئەو باغەوە • بەهەر حاڵ ووتمان : ئەو ڕۆژە (ژان‌واڵژان) لە گەردشگای (مارس) لەسەر کورسی‌یەك دانیشتبوو ، لەنکاو سێبەری زەلامێکی دی ، زانی یەکێك لەپاشیەوە ڕاوەستاوە • لەو کاتەدا کە خەریك بوو ئاوڕو وەداو هەستێ ، کاغەزێکی نوشتاوەوە کەوتە بەر پێی • وادیار بوو دەستێك لەپاشەوەرا بەسەرسەریدا بەردایەوە • کاغەزەکەی بەپەشۆکاوی هەڵگرتەوە ، نووسرابوو ـ جێگایەکەت بگۆڕە • (ژان‌واڵژان) بەپەلە لەجێی خۆی هەستا ، بەلام

کەسی نەدی ، تەماشایێکی وڵاتی‌کرد ، کوڕێکی تازە پێ‌گەیشتوو چاکەتێکی ڕەنگ خاکی لەبەردا بوو ، شاڵوارێکی مەخمەری ڕەنگی لەپێدا بوو ، لەسەر نێردیوانی باغەکەوە خۆی هەڵدایە ئەودیوو وون بوو • (ژان‌والژان) غەرقی بیرکردنەوە بوو ، گورج گەڕایەوە بۆ ماڵ •• ئەو ڕۆژە تائێوارە بێ‌مەبەست هەر هات‌و چۆی‌کرد • باران لە سەرخۆ دەباری ، بەڵام گوێی نەدەدایە • نانێکی بۆ ئێوارێ کڕی دەباخەڵێی نا • کەچی ئەویشی لەبیر چۆوە • ئەوەندەی بیر کردەوە ، لەوانەبوو بکەوێتە ناو چۆمی ( سین )ەوەو دەست بکا بەمەلە ، بێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێ •

زۆر بەبێ سەبوری چاوەڕوانی داهاتنی شەوی دەکرد • تەنیا بیری لەوە دەکردەوە کەسەعات نۆی شەو چاوی بە (کەزیە) بکەوێ • کە ئەوەش خۆش‌بەختی شیرازەی ژیانی ئەوی پێك دێنا • جار جار کە لە چۆڵترینی خیابانەکانی ( پاریس )دا پیاسەی دەکرد • لە دورەوە سەرو سەدایێکی عەجایبی دەهاتە بەرگوێ ، لەبەر ئەوە سەری بەرزکردەوە لە خۆی پرسی ئەوە لە (پاریس)دا شەڕە ؟

## « بـۆ کوێ ؟ »

لەو دواییانەدا (ژان‌والژان) (کەزیە)ی دڵخۆشی دایەوە کە لەگەڵ خۆی بەرێ بۆ گەڕان • ڕۆژێك لەناو باغێکی چۆڵدا دانیشتبوو بیری لە (تناردیە) دەکردەوە زۆری لاعەجایب بوو ، زۆر دەترسا ، بەتایبەتی حاڵەتی طواری لە (پاریس) ڕاگەیندرابوو بڕیاریدا نەك هەر لە (پاریس) بەڵکو لە (فەرەنسا) بڕوا بۆ (ئینگلتەڕە)و چوو بە (کەزیە)ی ڕاگەیاند بەتایبەتی زۆر لەو نووسراوە ترسا کە لەسەر دیوارەکە نووسرا

بوو ، ناوو نیشانی (ماریوس) بوو ، وەی زانی ئەوە دەبێتـــە هـــۆی هەڕەشە لەوو ناڕەحەتی (کەزیە) •

هەر کەشەو داهات ڕاست سەعات نۆ گەیشتە خیابانی (پلومە) • بەچـاو پێ کـەوتنی باغەکە هەموو شتێکی لەبیر چۆوە • چلو هەشت سەعات بوو لە گەڵ (کەزیە) یەکتریان نەدیبوو • ئەو مولاقاتە هەموو شتێکی لەبیر بردبۆوە ، زۆر دڵخۆش بوو ، چۆسەر دیوارەکەو خۆی هەڵدایە ناوباغەکەوە ، بەڵام (کەزیە) لەجێی جارانی نەبوو ، نەباغەکە تێ پەڕیو گەییە لای پلیکانەکانی خانوەکە گوتی : بێگومان لەماڵـەوە چاوەڕوانیم دەکا • بەڵام (کەزیە) لەوێش نەبوو •

سەری بەرز کردەوە ، پەنجەرەکان پێوە درابوون • لەباغەکـەدا کەڕا کەسی لێنەبوو ، گەڕایەوە ، ئیمانی لانەمابوو • وەك ئاغـــایەك بچێتەوە ماڵ لەدەرگابدا دەقوالبابی کرد ، چـــەند جار لەدەرگایدا ، چاوەڕوانی ئەوەبوو • پەنجەرەیەك بکرێتەوەو ناوچاوانی گرژی باوکی (کەزیە) دەرکەوێو پرسیاری لێبـکا ـ بڵێ • کێیو چ کارێکت هەیە؟ کەس وەڵامی نەدایەوە • دوبارە بەتووندی کوتایەوەو بەدەنـگی بەرز هاواری کرد (کەزیە) ـ (کەزیە) • وەڵام نەبوو • دڵی ڕوخـــا • • بە نەباغو نە لەماڵەوە کەس دیار نەبوو ، لەسەر قادرمێك لەداخان خـۆی بەعەرزێداداو گوتی : لەپاش (کەزیە) مردن بۆمن باشترە •

## « ماریوس هات »

لەنکاوێك لەناو دارەکـــانی باغــەکەدا دەنگێکی هاتە بەرگوێ ، هاواری دەکرد ئاغای (ماریوس) ! بەپەشۆکاوی ڕاست بۆوە گوتی :

ئەوە کێیە ؟ دەنگەکە لەپاش دارەکانەوە گوتی : ئاغای ( ماریوس ) هاوەڵەکان لە سەنگەری خیابانی (شانوروی)دا چاوەڕوانیت دەکەن • فەوری خاوەنی دەنگەکەی ناسی ، چونکە وەك دەنگە نووزاویەکەی (ابونین)ی کچە گەورەکەی (تناردیە) دەچوو •

بەپەلە ڕای‌کرد بۆ لای دەروازەی باغەکەو کردیەوەو سەری بردە دەرەوە ، لەو کاتەدا پیاوێکی دی وەك کوڕێکی گەنج دەچوو لەو سەری خیابان ڕۆیشت وون بوو •

## « شۆڕ گێڕەکان »

چاواچاکە سەریك لەسەنگەری شۆڕشگێڕەکان بدەین‌و بزانین ئەو پێتە مەعنای چی‌و مەوزوع چ‌جۆرە ؟ لە سەنگەرێکی بچوکدا شۆرش گێڕەکان چرایەکیان هەڵکرد بوو ، لەسەنگەری گەورەشدا ڕوناکی دیار بوو • ڕوناکی‌یەکە لەشتێکی وەك قەفەزدا بوو ، سێ لای بەبەرد هەڵچندرابوو ، تا (با) نەی‌کوژێنێتەوە • واش‌بوو ، ڕوناکی بەتەواوی لەعەلەمەکە دەدرا •

سەرو بەندی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا بوو • خیابان‌و سەنگەر خامۆش‌و بێ‌دەنگ بوون • هیچ دیار نەبوو غەیرەز عەلەمی سوورنەبێ، شەوێکی ئارام‌بوو ، هیچ دەنگێك نەدەهات • تەنیا جار جار لەدورەوە دەنگی تەقینەوە دەهات ، وادیار بوو ئێستا هێزی دەوڵەتی دەست بەکار نەبوو ، خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو • لەسەنگەری خیابانی (شانوروی) دا پەنجا کەس بەحاڵەتی ئامادەباش دانیشتبوون ، چاوەڕوانی شەصت هەزار کەسیان دەکرد • فەرماندە کەیان ناوی (انشرولراس) بوو زۆر بەبێ سەبری قەدەمی لێ دەدان •

ئەوانی‌دی وەکو (کورفی‌راك)و (بوسوت) و (زولی) (کـامبفر) لەپشتی سەنـگەرەکەدا دانیشتبوون‌و کوڕێکیش بەناوی ( گاوروش ) لەژێر زەمینێکی بەرامبەر سەنگەرەکەدا خەریکی تفەنگ پاکردنەوە بوو.

فەرماندەکە چۆ ژێر زەمینەکەو بە (گاوروش)ی گوت : تۆ زۆر بچوك‌و چالاکی‌و کەس نابینی ؟ هەستە بەو کۆلانانەدا بچۆ چاوێك بە خیاباندا بگێڕەو بزانە شەڕە ؟ یانا ؟ (گاوروش) هەستا ڕۆیشت . چەند دەقیقە بێ دەنـگی باڵی بەسەر سەنگەردا هێنا. (گاوروش) هـــاتەوە ، ڕوی‌کردە فەرماندەکەو گوتی : ئەو پیاوەی کە لە خیاباندا لـــە نزیك سەنگەرەکە ڕاوەستاوە ڕێبوارێك نیە ، بەڵـکە جاسوسەو من دەی‌ناسم . فەرماندە گوتی : بەراستە ؟ ووتی : بەڵێ ! سەر دەستەکەیان بە پەلـە لەژێر زەمینەکە هاتە دەرەوێ‌و چوو چەند وتەیێکی بەگوێی هاوالێکدا چپاند . کابرا هەستا چۆ لای ئەوانی‌ترو لەپاش ماوەیەکی کـــەم چوار نەفەر هەستان چوون بۆ لای ئەو پیاوە کەلەخیاباندا قەدەمی لێ‌دەدان ، بەخۆی نەزانی تا لەپاشەوە توند گرتیان‌و هێنایانە ژێر زەمینەکـەو لـــە کۆڵەکێکیان بەست .

(انترولراس) لێی نزیك بووە گوتی : ئاغا تۆ جاسوسی ؟ گوتی : من خاوەن مەقامێـکی وڵاتم : پێی گوت : ناوت چیـــە ؟ گوتی : ناوم (ژاور)ە . فەرماندە ئیشارەی کرد باخەڵیان پشکنی ، کارتێکی بچووکی لە باخەڵدا بوو ، لەدیوێـکی مۆری فەرەنسەی تێدرا بوو،لەدیوەکەی‌تری نووسرا بوو (ژاور) پشکنەری پولیس تەمەن پەنجاوو دوو ســاڵ . لــە ئاخریەوە ئیمزای رەئیسی پۆلیسی ئەوکاتەی بەناوی مسیو (ژیکوت) پێوە بوو . (انترولراس) ڕوی کردە رفیقەکانی‌و گوتی : ئـــەو پیـــــاوە جاسوســـە . لەپاشان ڕوی‌کردە (ژاور)و گوتی : تا دە دەقیقەی‌تر تۆ

تیره باران دەکرێ • لە کوچەی بلومە بۆ خیابانی (سن‌دنیس) • ئـەو دنگەی لە دڵی تاریکیداهات (ماریوس)ی بانگ‌کرد کە خۆی بەقەرارگای خیابانی (شانوردی) بناسێنێ ، لای وابوو دەنگی قەزاو قەدەرە • ئـەو دەی ویست بمرێ‌و ئەو هەلەش لەخۆوە هـەڵکەوتبوو • (ماریوس) دەروازەی باغەکـەی پێوە داو گوتی : باش وایە بڕۆم ! ( ماریوس ) دەرگـای گۆڕی دەکوتاو دەستێك لەتاریکیدا کلیلی ئەو دەرگایەی بۆ ڕاگر تبوو • ئیرادەی وەك ئی مرۆڤێکی بێ ئومێـد وابوو ، بانـگیان کردبوو ، دەبوو هەر بچێ • زۆر بەوریایی خۆی لەقەرەوڵان دەپاراست • کوچە بە کوچە ڕۆیی تا چۆ خیابانی (بتی‌سی)و چۆ بازاڕ •

لە قولینچکی کوچەی (بوردونی)یەوە چرا نەما ، خۆی لەوەزعێکی زۆر سام ئاوەردا دی • لەوێ بەدواوە نە سەرباز دیار بوو ، نە خەڵك • نەچرایەك دایسا ؟ نە زەلامێك دەبینرا • بێ دەنگی‌و ، تەنیایی‌و ، شەو ، هەر سێکیان دەستیان دەملی یەکتر وەرێنا بوو • چوونە ناو ئـەو بیرو خەیالانەوە وەك ئەوە وابوو ، بچیە ناو تاریکی ژێر زەمینێکەوە • بەرەو پێشەوە درێژەی بەڕۆین داو چۆ بازاڕ •

بێ دەنـگی باڵی ڕەشی بەسەر بازاڕیشدا کێشا بوو ، لە خیابانەکانی دیش دەنگێك نە دەهات • نوورێـکی ڕەنگ سوور لە خانوێکی دورەوە دیار بوو • لەسەنـگەری (کورنیت)ەوە دەهـات بەرەو وێ ڕۆیشت ، لەپاشان چوو بۆ کوچەی (پرشبورز) ئێشك‌گری شۆڕش گێڕەکان بێی نە زانی • لەوێوە چوو بۆ کوچەی (موندتور) • لە وێرا زۆر بەئاسـانی دەکرا بچێتە سەنگەری شۆڕش‌گێرەکان • سەنگەرەکە لەبەر خـانوان دیار نەبوو • چۆ پێشەوە گوێی لەدەنگی شۆڕش‌گێرەکان بوو لـــە ناو سەنـگەرەکەدا دەهات •

# « یەکەم هەنگاو ئالا »

ئێستا هەوالێك پەیدا نەبوو • سەعاتی گەورەی (سن‌مری) سەعات دەی شەوی ڕاگەیاند • (انترولراس)و (کومبفر) بە تفەنگەوە لەنزیك زالکی سەنگەرەکە ڕاوەستا بوون دەنگیان نە دەکرد ، گوێیان هەلخستبوو • لەنکاوێك لە ناوەڕاستی ئەو ئارامیو بێ دەنگیەدا دەنگێکی سافو دڵگیر هاتە بەرگوێ ، وادیار بوو لە ئاخری خیابانی (سن‌دنیس) دەهات ، بە دەنگێکی زۆر حەزین شیعری دەخوێندەوە •

(انترولراس) ڕوی کردە هاوەڵەکەیو بە پەشێویەوە گوتی : (گاوروش)ە بەڵێ دەی هەوێ بەو هۆیەوە ئیعلامی خەتەر بکا • لەو کاتەدا (گاوروش) بە هەڵەداوان لەسەر خیابان دەرکەوتو بەهەناسە بڕکێ خۆی گەیاندە کوچەو گوتی : کوا تفەنگەکەم ؟ خەریکن دێن • لەپاش چەند لەحزە دەنگی پێی کۆمەڵێك بێ‌دەنگی شەوی شکاند • ئەو دەنگە لەلای (سن‌لئد)ە دەهات ، لەپێشدا زۆر هێواش بوو ، بەڵام وردە وردە بڵندتر بۆوەو هاتە پێشەوە •

شۆڕش گێڕەکان چاویان لەتاریکی کوچەکەوە بڕی بوو ، بەڵام نەیان توانی ئەوانەی دەنگەکەیان نزیك دەبۆوە ببینن • تەنیا بریقەی سەرەنێزەو لولەی تفەنگیان دەدی • فەوری زانیان کە کۆمەڵێك سەربازی چەکدار بۆسەرکوت کردنەوەیان و لێك بلاوکردنی ئەوان لەو ناوچەیە نزیك دەبنەوە • کەمێك بێ دەنگیپەیدا بوو دەتگوت : هەر دولایان چاوەڕوانی بەلامارانی لایەکەیتر دەکا •

لەپڕ لەقوولایی سێبەردا دەنگێکی زۆر شومو ترسناك بەرز بۆوە ، لەبەر ئەوەی خاوەن دەنگ دیار نەبوو دەتگوت : لەغەیبەوە نیدایان بۆ هاتۆتە خوارەوە •

فەرماندەی سەربازەکان بەدەنگێکی بەرز گوتی : کێ لەوێیە ؟
دەر بەدوا ئەوەدا قرچەی چەخماخ ڕاکێشان بەرز بۆوە • (انشرولراس) لەوەڵامیدا بەتووندی گوتی : شوڕشی فەرەنسا ! ـ ئاتەش ، بڵێسەیەك کوچەی ڕوناك کردەوە ، وەك دەرگای کورەی ئاگر بکرێتەوەو بێتەوە دەیەوە ، دەنگی تەقینەوەیەك هات ، گوێی ئینسانی کەڕ دەکرد ، بارانی گوللە بەسەر سەنگەری شۆڕش گێڕەکاندا باری • ئاڵای ڕەنگ سوور سقوتی کرد • پەلامارێکی زۆر لەنکاوو مەرگ بار بوو • ( کورفی‌راك ) ڕوی کردە دۆستەکانی‌و هاواری کرد • هاوەڵان فیشەك بەخۆڕایی ماوێن ، لێیان گەڕێن با بەتەواوی بێتە خیابانێ ، ئەوکاتە دەسرێژیان لێ‌بکەن • دەنگی ڕاکێشانی چەخماخ هات • سەربازەکان تفەنگەکانیان پڕ دەکردەوە •

لەتەواوی ئەوماوەدا (گاوروش)ی بچووك‌و وریا لەشوێنی ئیشك گرتنی لە شۆڕشگێرەکان دور نەکەوتەوە • کە سەرنجیدا کۆمەڵێك سەرباز بەدزی‌و لەسەرخۆ لەسەنگەرەکەیان نزیك دەبنەوە ، هاواری کرد گوتی : ئاگاتان لەخۆتان بێ !

(کورفی‌راك) (انشرولراس) و (کومبفر) و (زولی) و ( باهورل )و (بوسوت) تێکڕا لەژێر زەمینەکە هاتنەدەرەوە • کۆمەڵێك سەرباز بە تفەنگ‌و سەرەنێزەوە هێرشیان هێنا بۆ سەر سەنگەرەکە ، کاتێکی زۆر ناسك بوو • هەموو ئانێك مەترسی گرتنی سەنگەرەکە دەکرا • (باهورل) لەنکاو پەلاماری دایە سەر سەربازێك‌و کوشتی ، بەڵام سەربازێکی‌تر ئەوی کوشت • یەکی‌تر پەلاماری ( کورفی‌راکی )داو ، سەربازێکی قەڵەویش بەسەرەنێزە حەملەی بۆ (گاوروش) برد ، بەڵام لەپێش ئەوەدا سەرەنێزەکەی بگاتە (گاوروش) تفەنگەکەی لەدەست کەوتە

خوارێ ، چونکە فیشەکێك هات ڕاست وەناوچاوانی کەوتو کوشتی • گوللەیێکی تریش هات ئەو سەربازەی کوشت کە پەلاماری (کورفی‌راك)ی دابــوو •

ئەوەی ئەو دوو سەربازەی کوشت (ماریوس) بوو کە تازە هـاتبۆ کوچە • (ماریوس) لەپێش ئەوەدا بچێتـــە ناو شۆڕشگێڕەکانو حەملە دەست پێ بـکا ، بەدو دڵی لەسەر کۆڵانەکـــە ڕاوەستا بوو ، بـەڵام لەئاخریدا بڕیاریداو بەهەر دوو دەماچەکانی دەستی کرد بە تەقــەو ، بەیەکەم دەست ڕێژ گیانی (گاوروش)و (کورفی‌راك)ی لە مەرگ رزگار کرد • بەڵام دەماچەکانی فیشەکیان تێدا نەماو چەکی‌تریشی پێ نەبوو ، خەریك بوو بچی بۆ لای زالکی سەنگەرەکەو لەنــکاو سەربازێك تفەنگی لێ ڕاکێشاو دەستی لەسەر بەلەپیتکەدانا خـــەریك بوو بیکوژی ، بەڵام لەپاشەوەڕا دەستێك هاتو لولەی تفەنگەکەی گرتو نزمی کردەوە ، ئەو دەستە دەستی کرێکارێکی شۆڕشگێڕ بوو ، بەڵام بەداخەوە تفەنـگەکە دەرچوو وە دەستی ئەو کەوتو کونی کردوو لەپشتی دەرچوو •

(ماریوس) چونـکە تازە دەچۆ سەنگەرەکـە ، ئەوەی بەتەواوی نەزانی • شۆڕشگێڕەکان کە لە حەملەی لەنـکاوی سەربازەکان واقیـان وڕمابوو ، پاشە کشەیان کرد •

انترولراس) لەترسی ئەوەی لەڕوی نەناسینەوە تەقە بکەن گوتی : ئاگاتان لەخۆتان بێ لەخۆڕا تەقە نەکەن •

زوربەیان چووبوونە قاتی دووەمو لەپەنجەرەکـانەوە دەسرێژیان دەکرد • سەرباز خۆیان گـــەیاندە خانوەکەو تەقە لــە نزیکەوە دەستی پێ‌کردو دەستەو ئێخە تێکەڵ بوون • لەو بـگرەو بەردەدا لەنـکاوێك یەکێك بانـگی کردو گوتی : زوکەن بڕۆن دەنا سەنگەرەکە دەتەقێنمەوە

دۆستو دوژمن بەهۆی ئەو دەنگەوە ئاوڕوی دایەو • لـەو کـاتەدا (ماریوس)چو بۆ قاتی خوارەوەو بەرمیلێکی پڕ لە دەرمان بەلادا خستبوو، لەسێ لاوە ئاگری کردبۆوە • تـەواوی فەرماندەو سەربازەکان بەواق وڕمانـەوە سەیریان دەکرد • (ماریوس) دوبارە گوتی : زوو بڕۆنـە دەرەوە تا نەم تەقاندۆتەوە ! فەرماندێك بانـگی کرد گوتی : ئاخر خۆشت لەبەین دەچی ! گوتی : قەی ناکا • هەر هاتو دەستە چیلێکی ئاگر هێناو خەریك بوو ئاگری بدا ، بەلام لەپێش ئەوەدا فەرماندەو سەربازەکـان کوژراوو بریندارەکانیان بەجێ هێشتو ڕایانکرد •

## « ڕەنجی مردن دوا ڕەنجی ژیان »

سەنـگەر کەوتەوە دەست شۆڕشگێرەکانو هەموویان هـاتن دەورەی (ماریوس)یان گرت • (مـاریوس) گوتی : فـەرماندەکەتان لەکۆییە ؟ (انترولراس) گوتی : تۆ فەرماندەی •

یەکێك لەسیفەتە چاکەکانی ئەو جۆرە پەلاماردانانە ئەوەیە کـە هەمیشە هێرش هێنـەر حەملە دەکـاو رێـگا ناگۆڕێ • جـا لەبەر ئەوە شۆڕشگێرەکان بەزۆری پارێزگاری سەنگەرە گەورەکـەیان دەکرد ، چونـکە دوبارە مەترسی هێرشیان هەبوو •

بـەلام ( ماریوس ) چونکە کرا بەفەرماندەی ئـەو کۆمـەلە شۆڕشگێرە ، کەوتە یادی سەنگەرە بچووکەکەو بەرەو وێ ڕۆیشت •

ئەو سەنگەرە زۆر نەهێنی بوو ، چرایەکی لەسەر هەلکرا بوو ، بە کەلەك دەورەی هەلچندرابوو • لەکاتێکدا (ماریوس) بەسەرەوە دەگەڕا، دەنگێکی زەعیفی هاتە بن گوێو دەی گوت : ئاغای (ماریوس ! (ماریوس)

واقی‌وڕما ، چونکه دەنگەکەی ناسیەوە • هەر ئەو دەنگەبوو کەدوو سەعات لەمەوبەر لەکوچەی (پلومه) دابانگی کرد بچێتە لای دۆستەکانی •

سەرنجێکی دەورو بەری‌دا کەسی نەدی • دەنگەکە هاتەوەو گوتی: ئاغای (ماریوس) • دوبارە کەس دیار نەبوو ، گوتی : لەبەر پێتان ! (ماریوس) داهاتەوە ، لەتاریکیدا دی یەکێك خۆی بۆلای ئەو دەخزێنی • ڕوناکی مانگ زەلامێکی پانتۆڵ دڕاوی بێ حواسی لەناو چۆگەله خوێنێکدا نیشاندا • کابرای کەوتوو سەری بۆ لای (ماریوس) بەرزکردەوە پرسی: ئایا من دەناسی ؟ گوتی : نەخەیر • گوتی : من (اپونین)م • ( ماریوس ) گورج داهاتەوە سەرنجی‌دا ، ئەوە (اپونین)ە لیباسی پیاوانی لەبەر کردووە • گوتی : ئەوە چۆن بوو هاتیە ئێرە ؟ چ ڕوی داوە ؟ (اپونین) لەسەرخۆ گوتی : خەریکم دەمرم •

(ماریوس) هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : ئەوە بریندار بووی ؟ سەبرکە ئێستا دەتبەم برینەکەت دەرمان بکەن • ـ چۆنت هەڵگرم ناڕەحەت • نەبی ؟ کوێت بریندار بووە ؟ ویستی پشتێندەکەی بگری ، دەستی وەدەستی کەوت • (اپونین) ناڵاندی ، (ماریوس) گوتی : ئەوە ئەزیەتم دای ؟ گوتی : کەمێك • (ماریوس) گوتی : خۆ هەر دەستمەوە دەستت کەوت • (اپونین) دەستی بڵند کردو لەپێش چاوی (ماریوس)ی ڕاگرت • (ماریوس) کونێکی ڕەشی دی بەدەستیەوە گوتی : ئەوە دەستت بۆ وایە ؟ گوتی : کون‌بووە ؟ گوتی : کون بووە ؟ بەڵێ : گوتی • بۆ کون بووە ؟ گوتی : بەفیشەك • گوتی : چۆن ؟ گوتی :

ئاگات لێبوو سەربازێك خەریك بوو تۆ بکوژیو دەستێك لەپاشەوەڕا لولەی تفەنگەکەی گرت ؟ ئەوە دەستی من بوو • (ماریوس) لەزریو گوتی : ئای چەند ئەحمەقی بەدبەخت ، بەڵام خۆ ئەو برینە

زۆر نیە ؟ لێم گەڕێ بابت بەم ، مرۆڤ بەو جۆرە برینانە نامرێ • (ایونین) ناڵاندی‌و لەسەرخۆ گوتی : ئاخو گوللە کە لە دەستم تێ پەڕی لـە پشتم دایە • بزاوتنم سوودی نیـە • ئێستا پێت بڵێم : کەچۆن لە دوکتۆر باشتر دەتوانی یارمەتیم بدەی ؟ وەرە لەسەر ئەو بەردە لەلام دانیشە •

(ماریوس) دانیشت‌و (ایونین) دەستی لەسەر ئەژنۆی ( ماریوس ) داناو بێ‌ئەوەی تەماشای بـکا گوتی : ئاخ چەند جوانە ؟ چەند ڕو خۆشە؟ بەڵێ ئیتر هیچ خەفەت ناخۆم :

لەپاشان سەری بەرز کردەوە لە (ماریوس) ڕامابوو گوتی : ئاغـای (ماریوس) دەزانی من زۆر نارەحەت دەبووم کە دەچوویە ناو باغ ؟ ئەوە من بووم ئەوێم بەتۆ نیشاندا • دە بوو هەر ئەوکاتە بمزانیایەکە : قسەکەی بڕی‌و پرسی لەپێش چاوی تۆ ناشیرینم ؟ گوتی : بزانە ئێوە هـەمووتان لەبەین دەچن • ئێستا کەس ناتوانی لە سەنگەر بچێتە دەرێ •

ئەوە من بووم تیرەم بەتۆ نیشاندا ! دەزانم تۆ لێرە دەکوژرێی • بەڵام کاتێ دیم ئەو سەربازە خەریك بوو بتکوژی دەستم لەسەر لولـەی تفەنگەکەی دانا •

چەند جێی پێکەنینە ! ئەوەم لەبەر ئەوە کرد ، چونکە دەم ویست لەپێش تۆدا بمرم •

لەکاتی ئەو قسانەدا دەستە بریندارەکەی لەسەر برینی سینگی دانا خوێن کوفارەی دەکرد •

(ماریوس) زۆر بەبەرۆشەوە تەماشای کرد • لەنـکاو ڕەنـگی (ایونین) تێك‌چوو ، دەستی لەچاکەتەکەی داوو گوتی : ئاخ ، دوبـارە هاتەوە ، وەختە گیانم دەرچی •

(ماریوس) پەشۆکاو کچە جوانەکـــە درێژەی پێداو هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : بەجێم مەهێڵە زۆر نازیم • لەســەر جێگای خــۆی دانیشت و دەکۆخی • ئاخــری گوتی : گوێ بگرە ، نام هەوێ فریوت بدەم : نامەیەکم لەباخەڵدایە بۆ تۆ نووسراوە ، لە دوێنێوە لەلامە ، ووتیان بیخنە پۆستەوە ، بەڵام ڕامگرت ، چونکە نەم دەویست بە دەستت بـگا • تازە هەرچی بوو ڕۆیشت ، ئەوە ئاخر دیدارمانە ، نامەکەت بــگرە • جمگەی دەستی (ماریوس)ی بەدەستە بریندارەکەی خۆیەوە نووسـاندو دەتگوت : لەخۆشیان دەردی لێ نەماوە • لەپاشان دەستی (مـاریوس)ی لەباخەڵی چاکەتەکەی نا ، دەستی وەکاغەزێك کەوت • کچەکە گوتی : هەڵی گرە • (مـــاریوس) هێنایە دەرێ • (اپونین) بەسپاوی گوتی : دە ئێستا بەڵێنم پێ بدە کە •••

ـ کـــە چی ؟

ـ بەڵێنم پێ بدە ؟

ـ زۆر باشە بەڵێن دەدەم •

ـ بەڵێن بدە کەمردم ناوچاوانم ماچ کەی ، چونکە من هـــەستی پێدەکەم • دەستی بەر بۆوەو چاوی لەسەرێك نان • (ماریوس) وەیزانی گیانی لەبەردا نەما • (اپونین) بێ حەرەکە ڕاکشا بوو ، لەوکـــاتەدا کە (ماریوس) لای وابوو نەماوە ، چاوەکانی کە مردنیان لێ نیشتبوو هەڵێنان و بەجورێك دەتگوت : خۆشی دنیایەکی‌دی دیوە ، گوتی : ئاغای (ماریوس) بزانە من تۆم خۆش دەویست • زەردە خەندێکی‌هاتە سەر لێوان و بۆ هەتا هەتایە چاوی لەسەرێك نان •

(اپونین) مرد • (ماریوس) بەڵێنەکەی بردە سەر • ناوچـــاوانی اپونین ئارەقی ساردی لەسەر کەوتبوو • ڕەنـگی زەردببوو ، (ماریوس)

ماچی کرد • ئنجا زۆر بەناڕەحەتی هاتە سەر بیری هەڵچڕینی کاغەزەکە، ئەوەندە پەشۆکا بوو توانای خوێندنەوەی نەبوو • گەڕایەوە چـــۆ ژێر زەمینەکەو لەبەر دەمـــی مۆمێك دانیشتو کاغەزەکەی کردەوە • ناوو نیشانێك بەدەست خـــەتی ئافرەت بەوجۆرە نووسرا بوو • بۆ ئاغـــای ـ ماریوس پونت مرسی ـ لەمەنزڵی ـ مسیو (کورفی‌راك) خیـابانی وردی ـ پلاکی ـ شازدە •

بەداخەوە باوکم دەی‌هەوێ بەو زووانە سەفەر بکا • ئیمشـــەو دەچینە خانووی ژمارە ـ حەوت ـ لە خیابانی ـ ( هوم‌آرمـــە ) تا حەوتویێکی‌دی دەچین بۆ (ئینگلتەرە) • کەزیە ـ چواری ـ حوزەیران • پاك‌داوێنی (ماریوس) بەجۆرێك بوو ، تەنانەت دەست خەتی (کەزیە)ی نەناسی •

خوێنەری بەرێز ـ ڕەنـگە باشتر وابێ ئەو کارەساتەت بەدرێژی لە چـەند دێرێـکدا بۆباس کـەم • لەپاش شەوی سێیەمی حوزەیران بیرێك کەوتە خەیاڵی (اپونین)ەوە ، کە فکری هاتە سەر ئەوە دوری بخاتە بەینی (ماریوس) و (کەزیە)وە •

هات لیباسەکانی خۆی داناو لیباسی کرێکارانەی لەبەرکردو چوو لە گەردشگاکەی (ماریوس) کاغەزێـکی فڕیدایە بەر پێی (ژان‌واڵژان) • لەکاغەزەکەدا تەنیا ئەوەندە نووسرا بوو ـ جێگاکەت وەگوێزە • ئـــەوە بوو ( ژان‌واڵژان ) هەڵی گرتەوە ، خوێنـــدیەوەو فەوری گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو بە (کـــەزیە)ی گوت : دەبێ ئیمشەو لێرە بڕۆین • لەگـــەڵ ( توسنت )ی خزمەت‌کار دەچین بۆ خیابانی ( آرمە )و لەپاش حەفتـەیەك دەچین بۆ (لەندەن) •

(کەزیە) بەو هەواڵە لەنـکاوە زۆر نیگەران بوو ، بەپەلە چـــەند

دێرێکی نووسی بۆ (ماریوس) بۆ ئەوەی ئاگاداری بکا ، بەڵام نەیدەزانی چۆنی لەپۆستەو بەرید باوێ ؟

چونکە قەت بەتەنیا لەماڵ نەدەچۆ دەرەوە ، ئەگەر بیشی دابایە بەکارەکەرەکە بیبا ، لەوەدەترسا بەمسیو (فشلونت) بڵێ • لەوکاتەدا (کەزیە) تەماشای کرد کوڕێك لەبەردەمی باغەکەدا پیاسە دەکا ، نەیزانی ئەوە (ایونین)ە لیباسی پیاوانی لەبەر کردووە ؟ بانگی کرد نامەکەو پێنج فرانکی دایە گوتی : زۆرت سپاس دەکەم ئەو نامەم بۆ بەرە ئەو جێگایە کە لە پشتی نامەکە نووسراوە • (ایونین) وەری گرتو دەباخەڵی نا •

رۆژی دوایی کە پێنجی مانگی حوزەیران بوو هەستا چوو بۆ مەنزڵی (کورفیراك) تا هەواڵی (ماریوس) بزانی ، بەڵام لەبەر ئەوە نا نامەکەی بداتێ ؟ بەڵکو هەر بۆ ئەوەی چاوی پێ بکەوی • لەمەنزڵی (کورفیراك) چاوەڕوانی ( ماریوس )ی دەکرد ، کە زانی ئەو شەوە شۆڕش دەس پێ دەکاو ( کورفیراك ) بە دۆستێکی گوت : شەو دەچین بۆ سەنگەر ، خەیاڵێکی بەرق ئاسای هاتە سەرەوە ، نەخشەیەکی بۆخۆی کێشا ، کە خۆی پێخستە داوی مەرگەوەرە • بەڵام دەیویست (ماریوس) بخاتە ناو شۆڕشو شەڕەوە•بۆیە تاقیبی (کورفیراك)ی کرد کاتێ بەسەنگەرەکەی زانین ، گەڕایەوە چوو بۆباغی کوچەی (پەلومە)•

ئەولێی ڕون بوو ، دەیگوت : چونکە (ماریوس) نامەی (کەزیە)ی دەست نەکەوتووە ، وەك شەوان لەکاتی خوێیدا دەچێتە وێ • (ماریوس) چۆوێو (ایونین) وەك زانیتان ناردی بۆسەنگەر بۆ لای دۆستەکانی و خۆشی دوای کەوت ، بەڵام خۆی بەداوی مەرگەوە بوو •

حەسادەتێکی بێجێ ، حەسادەتێکی عاشقانە لەبەینی بردو لەسەرە مەرگیشدا لای وابوو (ماریوس) دەکوژرێ ، لەدڵدا گوتی : خۆ تازە

بۆکەس نابێو پەیوەندی بەکەسەوە نابێ • بەهەرحاڵ با بگەڕێینەوە سەر مەبەستەکە •

(ماریوس) کاغەزی (کەزیە)ی ماچ کردو گوتی : دیارە منی خۆش دەوێ ، ئیتر نابێ بمرم : لەپاشان بەخۆی گوت : ئاخـر ئـەو لێم جیادەبێتەوە ، باوکی دەیبا بۆ (ئینگلتەرە) ، باپیریشم بەو ژن خواستنە ڕازی نیە ، دەبێ بمرم ، چونکە لەمردن چاکتر نیە •

لەپاشان بیری کردەوە کە دەبێ لەپێش مردندا دوو شتی گرنگ بکا • یەکەم (کەزیە) لە مردنەکەی ئاگادار بکاو دووەم خوا حافیزی لێ بکا • دەفتەرێکی لەباخـەڵ دەرهێنا ، لاپەڕێکی لێ کردەوەو نووسی پێك برانی منو تۆ مەحاڵە ، پرسم بە باپیرم کرد ڕازی نەبوو ، من ئیتر دوا ڕۆژێکم نیەو تۆش هەروا • چوومە ماڵتان تۆم نەدی • لەبیرتە ئەو بەڵێنەی پێم دای ؟ هەر لەسەر قەولی خۆمم ، مـن دەمرم ، چونکە تۆم خۆش دەوێ ، کاتێ ئەو نامە دەخوێنیەوە گیانم لاتدەبێو بە دەمتەوە پێدەکەنی •

لەبەر ئەوەی چەسپی لانەبوو ، نوشتاندیەوەو لە پشتەکەی نووسی ـ مادموازل ـ کەزیە ـ فوشلونت • مەنزڵی فوشلونت ، کوچەی لوهوم آرمە ، پلاکی ڕەقەم حەوت •

نامەکەی بەدەستەوە بوو ، خەیاڵی ڕۆیی ، لەپاشان وەرەقێکی تری لە دەفتەرەکە کردەوەو چوار دێری تری بەو جۆرە لێ نووسی دەتگوت : وەسیەت نامەیە ـ ناوم ماریوس پونت مرسی یە • جەنازەکەم لـە ماڵی باوکە گەورەم ـ موسیو ژیل نورماند ، خیابانی کالور ، ژمارە شەش لـە (مارائس) لابەری • لەپاشان دەفتـەرەکەی دەباخەڵێ نایەوەو بانـگی

(گاوروش)ی کرد • (گاوروش)ی گەنجی ئیشکچی بەبیستنی دەنگەکەی زۆر بەبێ‌خۆش‌حاڵیەوە هاتە پێشەوە •

(ماریوس) گوتی : ئایا کارێکم بۆ دەکەی ؟ (گاوروش) گوتی : هەرچی بت‌هەوێ ؟ ئەگــەر تۆ نەبوویتایە من ئێستا زیندو نەدەبووم • ئەو نامــەیە دەبینی ؟

ـ بەڵێ •

ـ هەر ئێستا لەسەنگەر وەرە دەروو ئەو نامە لە گەڵ‌خۆت بــەرەو بەیانی زوو بیدە بە مادموازال (کەزیە) ، بەو ناوو نیشانانەی لەپشتەکەم نووسی‌وە ، بیگەیێنە •

(گاوروش) گوێی‌خۆی خوراندو گوتی : زۆر باشە • (ماریوس) سپاسی کردو (گاوروش) ڕۆیی •

(گاوروش) شتێکی بەخەیاڵدا هات ، بەڵام نەی‌توانی بە (ماریوس)ی بڵێ : دەیگوت : ئێستا نیوە شەو نەبووەو خیابانی (آرمە)ش لێرەوە زۆرە دورنیە • کەواتە هەر ئێستا دەی‌بەم‌و لەپێش ئەوەی حکومەتی نیزامــی ڕابگەیندرێ دەگەڕێمەوە ، پێویست ناکا تابەیانی ڕادەستم •

## « جادەی پیاوە چەکدارەکە »

ڕۆژێــکی تۆف‌و باران بوو ، کە (ژان‌واڵژان) ویستی لــە ڕۆژی پێنجی مانــگی (حوزەیران)دا بچێتە خانوە تازەکەی لە شاریعی پیــــاوە چەکدارەکە ، کە بەسەرهاتێکی وون چاوەڕوانی دەکرد • بۆیەکەم جار (کەزیە) تۆزێك نابەدڵی نیشاندا ، بەڵام کــە زانی فائیدەی‌نیە حــازر بوو • (ژان‌واڵژان) لە گەڵ (کەزیە)و کارەکەرەکەیان گواستیانــەوە بۆ

ئەو خانوەی کە لە کووچەی (آرمە)دا بەکرێیان گرتبوو •

لەو ماڵ گواستنەوەدا کـە زۆرتر وەك هەڵاتن دەچوو زۆر شتی لەگەڵ خۆی نەبرد • شەو کەچوونە خانوە تازەکەوە بێ‌هەست نووستن، تەنانەت حەرەسی خانوەکەش هــەستی پێ نەکردن • ئـەو شـەوە (ژانوالژان) زۆر بەڕەحـەتی نووستو بەیانی بە خۆشیەوە لەخـەو هەستاو دەستی‌کرد بەڕێك‌خستنی ئەشیا • بەڵام (کەزیە) ئـەو ڕۆژە لەژوور نەهاتەدەر • تا کاتێ شەو داهات • دەوری سەعات پێنجی دوا نیوەڕۆ کارەکەرەکە سفرێـکی سپی هێنـا لەسـەر مێزەکە بڵاوی کردەوەو نانی ئێوارەیان خوارد • (کەزیە) سەری زۆر دێشا ، هەستا شەوباشی لە ژانوالژان کردو چۆوە ژوورەکەی خۆی •

لە سەر نان‌خواردن خزمەتکارەکە گوتی : قوربان • دەڵێن : لە (پاریس) شۆڕش دەستی پێ‌کردووەو شەڕە ؟ (ژانوالژان) هـەستا دەستی‌کرد بەقەدەم لێدانو زۆری پێ‌خۆش‌بوو • لەوکاتەدا لە نـکاو چاوی بەشتێك کەوت ، بێ ئیختیار لەجێگای خۆی وشك بوو ، ڕەنـگی ڕوانی پەڕی •

لەبەرامبەر ئەو ئاوێنەی کەلەسەر دۆڵابەکە هەڵاوەسرابوو ڕاوەستا چاوی بڕینە وێنەی ئەو نووسراوەی کـە لە ئاوێنەکـەڕا دیاربوو ، خوێندیەوە ــ نووسرا بوو •

عیشقی من ، زۆر بەداخەوە باوکم دەی هەوێ بەو زووانە بڕوا• ئەو شۆ دەچینە خانووی ژمارە حـەوت لە خیـابانی (هومآرمە) تا حەفتەیەکی‌تر دەچین بۆ (ئینگلتەرە) • (کەزیە) چواری ــ حوزەیران •

(ژانوالژان) بێ حەرەکەو بەبەشۆکاوی لەوێ ڕاوەستا • کەچوو

بوونه ئەو خانووەوە (کەزیە) ئەو وەرەقەی مەرەکەب وشك کەرەوەی لەسەر دۆلابەکە دانابوو کە نامەکەی (ماریوس)ی پێ وشك کردبۆوەو وێنەی ووتەکانی هەڵگرتبوو لەئاوێنەکەدا بەجوانی دەخوێندرانەوە • (ژان‌واڵژان) لە ئاوێنەکە نزیکتر بۆوە دووبارە خوێندیەوە • باوەڕی نەدەکرد ، لای‌وابوو چاوی ڕەشکەو پێشکە دەکا •

تا زۆرتری تەماشا بکردایە زیاتری بۆ ڕون دەبۆوە • ئاخری لەرزی‌و لەسەر کورسی‌یەك دانیشت‌و بەدەریای خەیاڵدا دەستی‌کرد بەمـــەلە •

ئیتر هەموو شتێك تەواو ببوو ، (کەزیە) پەردەی ڕەشی بەسەر هەموو شتێکدا هێنابوو •

لەکاتی ئەو ڕوداوەدا ئێستا (ماریوس) کاغەزەکەی ( کەزیە )ی دەست نەکـــەوتبوو ، دەستی قەزاوو قـەدەر ویستی ئەو نەهێنیە وەك نەهێنی خاینێك ئاشکرا بـکا •

(ژان‌واڵژان) هـــەرگیز تا ئـــەو ئەندازە بەهیچ ڕوداوێك تێك نەچووبوو • لـەژیانیدا زۆر دادگـــاو ، مەحکەمەو ، ئـــەشکنجەو ، ناڕەحەتی دی‌بوو ، بەڵام بەوئەندازە نەڕوخابوو •

هەمووگیانی لەرزی‌و زانی کە (کەزیە) ئەو نامەی بۆ ئەو کوڕە گەنجە نووسی‌وە ، کە وەخت‌و بێ‌وەخت دەهاتە گەردشگاکە ، ناوی کوڕەکەی نەدەزانی ، بەڵام بەدیمەن دەی‌ناسی •

(لەوکاتەدا (توسنت) هاتە ژوورەوە ، (ژان‌واڵژان) لەبەری هەستاو گوتی : لە (پاریس) شۆڕشەو شەڕبووە ؟

(توسنت) هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : بەڵێ ئاغا لەلای (سن‌مدی)

دەستی پێ کردووە •

بەعزە هەستێك بێ بەلگە زالدەبێ بەسەر ئینساندا • (ژانوالژان) لەدوا پێنج دەقیقە چۆ دەرەوەو بەسەری ڕوتی لەسەر سەکۆکەی بەردەرگا دانیشتو گوێی هەلخست •

## « وێڵ گەردی دوژمنی ڕوناکی »

خیابان چۆلو هۆلبوو • کومەلێکی کەم لەدەولەمەندە سەر لێ شێواەکان کە زۆر بەپەلە دەچوونەوە مالەوە چاویان پێ کەوت • چراهەلگری شارەوانی وەك هەمیشە هات چرای سەر کۆلانی ژمارە هەشتی هەلکردو گەڕایەوە •

هەر کەسێك لەو حالەتەدا (ژانوالژان)ی بدیایە نەی دەزانی ئەوە هەیکەلە ؟ یا گیان لەبەرە • دەنگی تیرەندازی ناو بەناو دەهاتە بن گوێ ، (پاریس)شێت ببوو • خرۆشابوو ، هاواری دەکرد • سەعاتی گەورەی (سن پل) یازدەی شەوی ڕاگەیاند • بە زۆری دەنگی تەقەو تەقینەوە لەلای بازاڕ دەهات ، دیاربوو دەنگی ئەو شەڕە بوو کە لە خیابانی (شانوردی) دەستی پێ کردبوو کە لە پێشەوە باسمان کرد •

(ژانوالژان) سەری بەردابۆوە بیری دەکردەوە ، کە دەنگێك دەهات سەری بەرز دەکردەوە • لەنکاو تەماشا بەرامبەری خۆی کرد ، یەکێك دیاربوو ، دەنگی پێیانی دەهات ، کەنزیك بۆوە کوڕێکی بالا کورتی ، لیباس شڕی ، ڕەنگ گۆڕاوبوو • هاتە پێشەوە ، (گاوروش)بوو تازە هاتبۆ خیابانی (آرمە) •

سەری بەرز کردەوە لە ئادرەسی مالانی دەڕوانی • دەیگوت : لە

ناڵێك دەگەڕی • هـــەر چــــەند (ژانواڵژان)ی دی ، بەڵام موبالاتی پێنەکرد • (ژانواڵژان) کە تا ئەوکاتە نە قسەی لەگەڵ کەس دەکردو، نە وەلآمی کەسی دەدایەوە ، زۆری پێخۆش‌بوو قسە لە گەڵ ئەوکوڕە بەرگ دڕاوە بەدبەختە بــکا ، تەماشایەکی کردو گوتی : کوڕە ئــەوە چ دەکەی ؟ (گاوروش) گوتی : برسیمە •

(ژانواڵژان) دەستی دەباخەڵی ناو پێنج فرانـکی دەرهێناو خستیە دەستی‌و لەبەرخۆیەوە گوتی : ئەی بێ نەوای برسی بەســتە زمـان •
(گاوروش) لووتی بەرز کردەوەو بەچاو پێکەوتنی ئەو پێنج فڕانـــکە واقی‌وڕما ، بردیە بەر ڕوناکی چراکە ، تاجوان تێی فکری ، چونکە تا ئەوکاتە هـــەر ناوی پێنج فڕانـکی بیستبوو ، بەڵام بەخزمــــەتی نە گەی‌بوو • گوتی : ئاغا دیارە تۆ پیاوێکی زۆرگەورەی •

پارەکــــەی دەباخەڵێ ناو بەدڵ ئاسودەییەوە پرسی ـ تۆ لــــەو گەڕەکەی ؟

ـ بەڵێ بۆ ؟
ـ دەکرێ خانووی ژمارە حەوتم نیشان بدەی ؟
ـ چ کارێکت بەخانووی ژمارە حەوتە ؟
ـ کەوتە گومانەوەو سەری خۆی خوڕاندو گوتی : هیچ هیچ •

لەنـکاو فکرێك کەوتە مێشکی (ژانواڵژان) ڕوی کردە کوڕەکە گوتی : ئەو نامەی چاوەڕوانم دەکرد هێناوتە ؟

(گاوروش) بەسەر سوڕمانەوە گوتی : نامە ؟ خۆ تۆ ئافرەت نی ؟ (ژانواڵژان) گوتی : مەگەر بۆ مادموازل (کــــەزیە) نیە ؟ (گاوروش) لەبن لیوەوە وەلامی دایەوە ـ (کەزیە) بەڵێ وایە •

ـ زۆر باشە بمدەنێ تا بۆی بەرم •

گوتی : کەواتە تۆ دەزانی کە منیان لەسەنگەرڕا ناردووە ، دەستی دەباخەڵ ناو کاغەزەکەی دەرهێناو گوتی : فەرموو ، بەڵام پەلە بکە ، چونکە ئەو ئافرەتە زۆربەبێ سەبری چاوەڕوانی دەکا • (ژان‌واڵژان) نامەکەی وەرگرت‌و چۆوەماڵێ • بەقادرمەکاندا سەرکەوت‌و گوێی ڕاگرت (کەزیە)و (توسنت) خەوتبوون • چرای هەڵکردوو دەستی‌کرد بەخوێندنەوەی •

نامەکەی خوێندەوە ، بەڵام چەند کەلیمە سەرنجی زۆر ڕاکێشا •

ـ من دەم هەوێ بمرم • کاتێ ئەو نامە دەخوێنیەوە ڕوحم لەلات دەبێ •••

ماوەیەك تێی فکری‌و ئەو ووتانە لەپێش چاوی دەهاتن‌و دەچوون • یاد داشتەکەی (ماریوس)ی زۆر بەسەرسامیەوە تەماشا کرد • لەپاشان هەستا خزمەت‌کارەکەی هەستاندو سەعاتێك دوا ئەوە بەلیباسی پاسەوانی گەلەوە تفەنگێکی‌پڕو هەگبەیەکی فیشەك هەڵگرت‌و چوو بۆ بازار •

## « مردن بۆ منە بۆ تۆ نیە »

( انشرولراس ) بەتوڕەییەوە بانگی‌کرد ـ هاوشاریەکان جمهوری توانای زۆری نیە ، ئەگەر پێویستی بەهێزی زیاتربێ دەبێ ئێوە گیانی خۆتان فیدا بکەن • ئێمە لێرەدا کەوتوینە داوەوە ، بەو زووانە دەکوژرێین •

دەبێ هێندێکتان گیانی خۆتان نەجات بدەن تا بتوانن بچنە گەڵ

سەرەکی شۆڕش گێرەکان • یەکێك لەناویاندا بە دەنگی بەرز گوتی : ئێستا نیوە شەو زیاترەو حکومەت نیزامی یە ، هەر لەسەنگەر بچینە دەرێ تووشی قەرەوڵەکان دەبین و دەمان ناسن و دەس ڕێژمان لێ دەکەن •

(انترولراس) گوتی : زۆر باشە ئێستا بە دەبەرکردنی ئەو لیباسانەوە دەتوانن خۆتان رزگار بکەن ، کەس بەرگریتان ناکا • ئێمە جمهوری خوازین ، دەمان هەوێ ڕژیمی سەڵتەنەتی لەبەین بچێ ، کێ حازرە بڕوا ، بێتە پێشەوە ؟ ئێمە لێرە بەتەڵەوە بووین ، هەر کەس داو تەڵەبە خۆی نەجات بداو بچێ یارمەتی جمهوری خواکان بدا ، بێتە پێشەوە •

پێنج کەس چوونە پێشەوەو داوتەڵەبی چوونە دەر لە سەنگەروو رزگاردانی گیانی خۆیان بوون • (ماریوس) تەماشای کردو گوتی : ئێوە پێنج نەفەرن و لیباسەکان چوارن ، هەموانیان گوتیان : ڕاست دەکەی ، دەبێ یەکێك وەمێنێ • بەڵام هەرکەسە دەی ویست ئەو نەمێنێتەوە • یەکیان بەوەی تەنیشتی خۆی گوت : تۆ ژنەکەت خۆشی دەوێی وەمێنە •

ـ تۆ دایکێکی پیرت هەیە وەمێنە •

ـ تۆ نەباوکت هەیە • نە دایك ، ئەگەر شێکت بەسەر بێ ئەو سێ برا فەقیرەت چ بکەن ؟ تۆ وەمێنە •

ـ تۆ باوکی پێنج منداڵی تۆ وەمێنە •

ـ تۆ تەمەنت هەفدە ساڵە ئێستا کاتی مردنت نەهاتووە تۆ وەمێنە • هەر کەس دەی ویست رفیقەکەی بڕواو خۆی وەمێنی • (کورفی راك) بە توندی گوتی : پەلە بکەن ، کاتەکەمان بەفیڕۆ دەڕوا • یەکیان ڕوی کردە (ماریوس)و گوتی : دەخۆت یەکێك دیاری بکە با وەمێنێ ،

(ماریوس) کە گەورەو سەر دەستەیان بوو کەوتە ئەمری واقیعەوە ، نەی
دەزانی چی‌بکاو کامەیان وەگیرێ ؟

لەو کاتەدا یەکێك هات ، قاتێکی تری لیباسی سەربازی لە سەر چوار
دەستەکەی تر دانا • (ماریوس) ســـەری بەرزکردەوە چاوی بە مسیو
ـ فوشلونت ـ ژان‌والژان کەوت •

لـــەبەر ئەوەی بەخیابانی (موندەتور)دا هاتبوو ، لەپشـــتی
سەنگەرەکەوە ، نە شۆرش گێرەکان دی بوویان ، نە قەرەوڵەکان ، کاتێ
گەیشتەوێ ، لەبەر ئەوەی لەوکـــاتەدا هەموان تەماشا جلە سەربازی‌یە
کانیان دەکرد ، کەس نەی‌زانی • بۆ دەنگی‌یەکی‌وا باڵی بەسەردا هێنان
بەزمان‌و قەڵەم بەیان ناکرێ •

ـ (باسوت) پرسی ئەو پیاوە کێیە ؟

(کامبفر) گوتی : ئەوە مرۆڤێکە گیانی مرۆڤێکی نەجات داوە •
(مـــاریوس) گوتی : مـــن دەی‌ناسم‌و ئەوەبوو بەهۆی دڵ ئارامی‌و ،
(انترولراس) ڕوی کردە (ژان‌والژان) و گوتی : هەمشاری بەخێـــر
هاتی • دیارە دەزانی کە ئێمە لێرە دەمرین •

(ژان‌والژان) بۆ ئەوەی وەڵامێك بداتەوە ، خەریك بوو بەرگـە
سەربازیەکەی لەبەر نەفەری پێنجەم دەکرد •

بەرە بەرە دنیا ڕوناك دەبۆوە ، بەڵام نە دەرگایەك کەوتە ســـەر
پشت‌و ، نە پەنجەرەیەك کرایەوە • دەمی خیابان پڕ بوو لەســـەرباز
دیاربوو وەزع داڵۆزا •

سەنگەرەکەیان قایم‌تر کردبوو • چاوەڕوانی شۆڕش گێرەکـــان
زۆری نەخایاند کە دەستێك سەربازی چەکدار دەرکەوتن •

(باسوت) ڕوی کردە چەکدارەکانو هاواری کرد : بوو بەتەقـە ، لە هەر دوو لا گوللە دەبارین • دوکەڵ دنیای تاریك کرد ، دەتگوت : ڕۆژی حەشرە • هێندێك لەشۆڕش گێرەکان حەملەیان کردە سـەر سەربازەکان • (گاوروش) لولەی تفەنـگەکەی کردە سـەربازێکو کوشتی ، بەڵام لەپڕ فیشەکێك هـاتو لەچاوی‌داو ، بەلاداهـات • (ماریوس) لەسـەنگەر دەرپەڕی‌و داهاتەوە ، تەرمی (گـاوروش) دەربازکا • گوللەیەك بەلای سەریدا ویزاندی‌و ، سەری ڕوشـاند ، بەڵام گوێی نەدایە ، تا (کورفی‌راك) لەسەنگەرەکەدا بۆی دەرمان کردە

## « کەلاك خۆر دەبێتە مەڕ »

لەنـکاو ، لە ناوەڕاستی ئەو بگرەو بەردەدا ناقووسی ( کلیســا ) دەستی کرد بەڕاگەیاندنی سەعات دوازدەو (کامبفر) گوتی : نێـــوە ڕۆیە • ئێستا زەنـــگەکە دوازدەی تەواو نەکرد بوو کە (انترولراس) دەرپەڕی‌و چـــۆ سەر سەنگەرەکە هاواری کرد ـ هێندێك بەرد بێنـە زورەوەو لەپشت پەنجەرەکانەوە دایان نێن زووکەن •

تا چاو لەسەرێك دەنێی ئەو کارە کراو دەمی سەنـــگەر گیـــراو (انترولراس) ڕوی کردە (ماریوس)و گوتی : منو تۆ دوو فەرماندەین • دەستوراتی داخیلی بەحەواڵەی منو ، تۆش بچۆ دەرەوە ئاگـات لـــە نەفەرەکـــان بێ • (ماریوس) لە گۆشەیەك دانیشتو دەستی کـــرد بەســـەرنج دان •

دوا ئەوەی (انترولراس) کارەکانی خۆی تەواو کرد ، ڕوی کردە (ژاور) کـــە لەکۆڵەکەیەك بەسترابوو گوتی : تۆم لەبیر نەچۆتەوە •

دەماچەکەی لەسەر مێزەکە داناو گوتی : ئەوەی لەئاخریدا دەچێتە دەر مێشکی ئەو جاسوسە بپرژێنی •

یەکێك پرسی : هـــەر لێرە ؟ گوتی : لێرە نا ، بیبەنە سەنگەرو لە وێ بیکوژن : لەو کاتەدا (ژانوالژان) کە بەرگی شۆڕش گێری لـەبەر کردبوو ، چـــۆ ژێر زەمینەکەوەو ، لە (انشرولراس) پرسی : ئایا تۆ فەرماندەی ؟

ـ بەڵێ •

ـ ئایا منت بانگ کردووە ؟

ـ بەڵێ بە ناوی جمهوری • سەنگەرەکەمـــان دوو رزگارکەری

هەیە • یەکەم مسیو پونت مرسیو دووەم تۆ •

ـ تۆ لات وایە کەمن لایقی ئەو پاداشتەم ؟

ـ بەڵێ تۆ فیداکارێکی زۆر گەورەت کرد ، کە یەکەم گیـــانی خۆت خستە خەتەرەو ، دووەم گیانی یەکێ‌ترت رزگارکردو لەوانەیـە ئەو پێنج کەسە هێزی یارمەتی بێنن‌و تۆ پاداشت وەرگری •

ـ کەواتە ئیجازە بدە خۆم پاداشتی خۆم دیاری بکەم •

ـ ئیجازەم بدە من مێشکی ئەو پیاوە بپرژێنم : (ژاور) ســـەری بەرز کردەوەو چاوی بە (ژانوالژان) کەوت • (انشرولراس) تفەنگەکەی پڕ کرد لەفیشەك‌و تەماشای دەورو بەری‌کردو گوتی : زۆر باشە کەس بەرگریت ناکا جاسوس بکوژی •

کـــاتێ کەهەر (ژانوالژان)و (ژاور) مانەوە بە (ژاور)ی گوت : هەستە (ژاور) هەستایە سەرپێ ، بەزەردەخەنەوە • (ژانوالژان) یەخەی

گرتو وەك حەیوانێك بەدوا خۆیدا ڕاکێشرایە دەرەوە لە ژێر زەمینەکە • دەماچـــەی بەدەستەوە گرتو بردی بۆ سەنـگەر • شۆڕشگێڕەکـان چاوەڕوانی هێرشیان دەکرد ، رویان لەولا بوو • (ماریوس)نە بێ کەس نەی دین • (ژانوالژان) بەمەترسیەوە (ژاور)ی گـــەیاندە کوچـــەی (موندەتور)و چوونە سەر دیواری سەنگەرەکە تۆزێك نەدیو بوو ، کەس چاوی لێ نە بوون •

دەماچەکەی دەباخەلێ ناوو چاوی دە (ژاور)ەوە بڕین ، چـــاو تێ بڕینێك بەزمانی بێزمانی گوتی : (ژاور) ئەوە منم •

تەرمی کوژراوی زۆر لەو دیو کەتبوو • (ژاور) گوتی : تۆلـەی خۆت بکەوە (ژانوالژان) کێـــردێکی لەباخـەڵ دەرهێنا • (ژاور) وەیزانی بەو کێردە سەری دەبڕی ، گوتی : مـــەرگی بەعـــەزابو ئەشکنجە ؟ بەڵێ ئەوە شایانی منە •

(ژانوالژان) بەکێردەکە پەتـکی ملی (ژاور)ی هەڵبڕیو دەستو قاچی کردەوەو گوتی : ئێستا تۆ ئازادی •

(ژاور) پیاوێك بوو هـەلکەوتوو ، بەدەگمـــەن دەپەشۆکـــا • (ژانوالژان) دریژەی بەقسەکان داو گوتی : من بەزیندویی لێرە رزگـار نابم ، ئەگەر خوا کوشتمی ، ناوو نیشانەی ماڵەکەمان ئەوەیە ـ خیـابانی (آرمە) • ژمارە حەوت ناوم (فوشلونت)ە •

(ژاور) وە دەنگ هاتو لەسەرخۆ گوتی : تێبینی بکە زوو بڕۆو پرسی گوتت : فوشلونت ـ خیابانی آرمە ؟ ئەوەی دوبارە کردەوەو سەری بەردایەوەو لەسەرخۆ چۆ خیابانو دورکەوتەوە • (ژانوالژان) تا ئـاوا بوو تەماشای کرد • لەپاشان فیشەکێکی هەڵ تۆقاندو هـــاتەوە گوتی : تەواو بوو •

## « قارەمانان »

لەنـکاو تەپڵی هێرش بردن لێدرا ، حەملە وەك تۆفان هـەستا • دەستەیەك لەپیادە ڕەوی نیزامی لەگەڵ گاردی میللیو گاردی شارەوانی ڕژانە خیابانەوە • تەپڵو شەیپوور لێدرانو سەرە نێزە لەتفەنگان درانو، وەك تۆفان لەسەنگەری شۆڕش گێرەکان نزیك بوونەوە • هێرش لەسەر هێرش دەکراو هەر دەهاتو نزیك دەبۆوەو وەزع ئاڵۆزتر دەبوو • دو جار لەسەنگەر نزیك بوونەوەو زۆریان ڕوخاند ، بەڵام بۆیان نەگیرا •

(بوسـوت)و (فـئـولی) و (کورفی‌راك)و (کـامبفر) کوژران • (ماریوس)بە برینداری هەر شەڕی دەکرد • سەری بریندار بوو ، گیانی لەخۆیندا شلاڵ بوو • (انشرولراس) و (ماریوس) نەبێ ، سەر دەستەکان هەموو کوژران • ئاخرین هێرشیان کردە سـەر سەنگەرە کـەیان شۆڕش گێرەکان شکان • سەرباز سەنگەرەکەیان تێكو پێكدا • گوللەیەك سەرشانی (ماریوس)ی شـکاندبوو ، خەریك بوو بێ هۆش بـکەوێ • لەنـکاو دەستێك هاتو گرتی : (ماریوس) ئاگای لەخۆی نەبوو • لەپێش ئەوەیدا ئێستا بەتەواوی بێ‌هۆش بێ (کەزیە)ی هەر لەیاد بوو ، لـەبن لێوانەوە گوتی : من ئەسیرمو تیرەبارانم دەکەن •

## « ئەسیر »

لەواقیعدا (ماریوس) ئەسیر بوو ، بەڵام ئەسیری دەستی (ژانواڵژان) لەو ئاگروو دوکەڵەدا (ژانواڵژان) چاوی لە (ماریوس) نەگواستبۆوە • کاتێ بریندار دەبێ وەك بەوری بەیان پەلاماری دەداو دوری دەخاتەوە •

لەوکاتەدا زوربەی هێرش لەسەر دەورو بەری دەروازەی خانوەکە

بوو ، که (انترولراس)و کۆمەڵێك لەشۆڕشگێرەکان بەر هەڵستیان لێوە دەکرد • لەبەر ئەوە کاتێ (ماریوس)ی بە بەردەمی سەنگەرەکەدا بـرد کەس نەیدی • کە گەیشتە پشتی ئەو خانوەی لەئاخری کوچەکـە بوو (ماریوس)ی داناو ڕاوەستا • ئنجا چۆ پەنا دیوارەکەو تەماشایەکی ئەملاو ئەولای کرد • وەزع زۆر ئاڵۆز بوو •

تەماشا خانووی بەرامبـــەری‌و سەنگەرەکەی تەنیشتی کردو لـە عەرزەکەوە ڕاما • وای دەنواند ـ دەتگوت : دەی هەویێ لـەو کـاتە نا ئومێدیەدا چاڵێك ، زێرابێك ڕەچاوکا • خۆی تێدا حەشار بدەن • لەنکاو لەچەند هەنـگاو دورتر ، لەتەنیشت دیواری کوچەکە ، لەناو چـــەند بەردی گەورەدا ســەر پۆشێکی ئاسنی کون‌کونی چوار کۆشەی دی ، دیار بوو ئێستا سەرەکەی قایم نەکرا بوو • لە کەلێنی شیشەکانیەوە ڕوانی دەمی بۆڕیێکی گـــەورە دیار بوو • گورج پەلاماری‌دا ، بەردەکـــانی لابردن‌و سەرپۆشەکەی هەڵدایەوە ، شانسی خۆیان ، چاڵەکە زۆر قووڵ نەبوو • (ژان‌واڵژان) هات ، وەك هەڵۆ داهاتە (ماریوس)و لە ماوەی چەند چرکە سەعاتدا بردیە ناو چاڵەکەو ، سەر پوشەکەی دادایەوە • لـەوێدا بێ دەنـگی فەرمان ڕەوا بوو ، گوێیان لەهیچ سەرو سەدایەك نـە بوو • بۆ ئارامی وەك ئەو کاتەی دەهاتە بەرچاوان کە (کەزیە)ی بردە کلیسا •

## « زێرابی پاریس »

ئەوچاڵە زێرابی (پاریس)بوو • لەپاش ماوەیەك چاوانی خـوویان بەتاریکیەوە گرت • ڕوناکیێکی زۆرکز لەکەلێنی شیشـــەی سەرپۆشە کەوە دەهاتە ژورەوە • لـــە لای سەرەوە مەترسی گەورەو ، لـــە خوارەوەش مەترسی چوونە ناو ئەو کەسافەتەوە هەڕەشەی لێ دەکردن ،

بەڵام هیچ چارە نەبوو • (ماریوس)ی لە کۆڵ کردو دەستی کرد بـــە ڕۆیشتن بەناو زێرابەکەدا ، بە دەستێکی هەر دوو دەستی (ماریوس)ی لەگەردنی خۆی قایم گرتبوو ، دەستەکەی تریشی لەدیواری زێرابەکـە دەکوتاو بـــەرەو پێشەوە دەڕۆیی • خوێنی برینی (ماریوس) بەســەرو چاویدا دەهاتە خوارێ ، بەڵام لەبەر ئەوەی گوێی لەهەناسەی ماریوس)بوو دەر بەست نەبوو •

لەپاش ماوەیەك هەستی پێ کرد کە لە ڕاستی سەنگەرەکان تێپەڕیوەو گەیوەتە ڕاستی ئەو جێگایە لەشار کە ئارامە •

گوێی هەڵخست دەنـگی دوچەرخـەو عەرەبانە دەهات کـەهاتوو چۆیان دەکرد • تا دەهات زێرابەکە تاریکتر دەبوو ، سەرەوەشی نەویتر دەبوو ، بەڵام ئەو هەر ڕانەوەستا ، خۆی دادەنەواند تا سەری (ماریوس)ی لێ نـەدرێ •

سەعات سێی دوا نیوەڕۆ گەیشتە ناوەڕاستی زێرابەکە ، لـە وێڕا زێرابەکە پانو بەرز بۆوە • زۆر ماندو بوو ، پشوێـکی‌دا • لە هەواکێشی ڕاستی خیـــابانی (دوانزو)وەوە ڕوناکی دەهـــاتە ناو زێرابەکـەوە • (ماریوس)ی دانا تەماشای کرد ڕەنـگی دەتگوت : ڕەنـگی مردووە لـــە ناو گوڕدا ، چاوی لەسەریەك نابوون • مووەکانی لەخوێندا شەڵاڵ ببوون، خوێنی مەیوی دەمی داپۆشی بوو • (ژانواڵژان) کراسەکـــەی خـــۆی داکەندو دای دڕیو برینەکانی پێبەست تا خوێن ڕێژیەکەی بوەستی •

باخەڵی (ماریوس)ی پشکنی نانێکی ڕەقو دەفتەرێکی یاد داشـــتی هێنایە دەرێ • نانەکـەی خواردو سەیری دەفتەرەکەی کرد لە لاپەڕەی یەکەمی وەك وەسیەت نامـە ــ بەوجۆرەی نووسی بوو ــ ناوم مـاریوس

بونت مرسی • ئەرمەکـــەم بەرنەوە بۆ ماڵی بابە گـــەورەم ـ مسیو ژیل نورماند ، لەخیابانی (کارلو) ژمارە شەش لە (مارائیس) • دەفتەرەکـــەی خستەوە باخەڵی (ماریوس)و لەکۆڵی کردەوەو درێژەی بەڕۆین دایەوە •

لەپاش بەینێك (ژانواڵژان) هەستی بەوەکرد کەبەرپێی ڕۆدەچی ، کەوتە ناو قوڕوو لیتەی ژێرابەکەوەو وەك باتلاغێك ئینسانی پێـــدا دەچۆ خوارێ • بەڵام دەبوو هەر بڕوا چـــارەی نەبوو ، نـــەدەکرا بۆ دواوە وەگـــەڕێ •

گەیشتە شوێنێك ئاو دەهاتە ئەژنۆیانی • (ماریوس)ی بەهـــەر دوو دەست بەرزکردەوە ، ئاو گەیشتە ژێر چەناگـــەی ، ســـەری بۆ دواوە بەرزکردەوە تا ئاو نەچێتە دەمیەوە ، لەو سەر بەرزکردنەوەدا چـاوی بە ڕەنـگی پەڕیوی (ماریوس) کەوت ، هەناسێکی قووڵی هەڵکێشاو درێژەی بەڕۆیندا •

پێی وەڕەقایی کەوتو وردە وردە ئاو کەمبۆوەو گەیشتە وشـکی ، لەسەر بەردێك دانیشتو سپاسی خوای کرد •

ئاخری بەسەرماو لەرزینو قووڕاوەیەوە هەستاو (ماریوس)ی لـــە کۆڵ کرد • لەوکاتەدا هەناسێکی درێژی هەڵکێشا ، بەڵام ڕوحی نورێکی زۆر غەریبو عەجایب ڕوناکی کردبۆوە •

## « گەیشتە وشکی »

دوبارە کەوتەوە ڕێ • زۆر بەنائومێدیو بەپەلە دەڕۆیی • ســـەت هەنـگاوێك ڕۆیبوو ، سەری بەرز نەکردبۆوە ، لە نکاو سەری وەدیوار کەوت • گەیبۆ گۆشـــەی ژێرابەکە ، چونـکە ســـەری نەوی ببوو

لەدیوارەکەی دابوو • کە سـەری هەڵبڕی لەئاخری کونەکەی ڕوانی ڕۆوناکیەکی سپی دیار بوو ، ڕۆشنایی ڕۆژ بوو •

گەیشتە زالکی کونەکە ڕاوەستا ، هەرچەند زالك بوو ، بەڵام ڕێی پێدا چوونە دەری نەبوو • دەرگایەکی ئاسنی ژەنـگاوی داخراوی پێـوە بوو • لە کەلێنی شیبانەکەیڕا قفڵو ئاڵقەڕێزەکەی دی ، چوو بەهەر دوو دەست ڕای وەشاند ، میلەکانی تەکاندا ، نە جووڵان • پشتی پێوە ناو سەری وەئەژنۆیان کرد • لەوکاتە ناسکەدا بیری لە (کەزیە) دەکردەوە •

لە ناوە ڕاستی ئەو هەموو گرفتاریەدا ، دەستێك لەنـکاو هاتە سـەر شانیو دەنگێك لەسەرخۆ گوتی : شەریکین • سەری هەڵبڕی زەلامێك چاکەتێکی کۆنی لەبەردایەو ، پێڵاوەکانی دەبن هەنگڵێ گرتووەو ، بـە بێخواسی لەبەرامبەری ڕاوەستاوە • لەبەر ئەوەی بەپێی پەتی هـاتبوو هەستی پێ نەکرد بوو •

دیتنی ئەو پیاوەی لەو زێرابەدا زۆر لاسەیر بوو ، فەوری ناسی کە ئاغای (تناردیە)یە ، بەڵام ئەو ئەمی نەناسی •

چـەند چرکە سەعاتێك تێكڕامان ، ئاخری (تناردیە) بێ دەنـگی شکاندو گوتی : چۆن لێرە دەچیە دەر ؟ (ژانواڵژان) وەڵامی نەدایەوە • (تناردیە) درێژەی پێدا ـ قابیل نیە دەرگا بکرێتەوە ، بەڵام دەتوانی پـارە بدەیو بچیـە دەر •

ـ زۆر باشـە •

ـ کەواتە دەبینە شـەریك •

ـ مەبەستت چیـە ؟

ـ (تناردیە) ئیشارەی بۆ پەیکەری (ماریوس) کردو گوتی : تۆ ئەو

پیـــاوەت کوشتووە • من کلیلی دەرگـاکەم لایە ، من تۆ ناناسم ، بەڵام پێم‌خۆشە یارمەتیت بدەم • بێ‌گومان تۆ دۆستی •

(ژان‌واڵژان) زانی کە (تناردیە) وە دەزانی (ماریوس)ی کوشتووە • (تناردیە) گوتی : گوێ‌بگرە ڕەفیق ، تۆ ئەو پیاوەت بەخۆڕایی نەکوشتووە؟ زانیوتە شتێکی دەباخەڵدایە • ئەوەی دەستت کەوتووە لەگەڵم بەشـــکە تا دەرگاکە بـکەمەوە •

لەپاشان کلیلی لەباخەڵ دەرهێناو گوتی : ئەوە ئی ئەو دەرگایەیە • ئامادەشم ئاڵو گوڕێك لەگـــەڵ پۆتینەکـــانت بـکەم • ( ژان‌واڵژان ) بەسەرسامیەوە تێی فکری‌و (تناردیە) پەتکێکی لەژێر چاکەتەکەی دەرهێناو دای بە (ژان‌واڵژان)و گوتی : ئەوە بگرەو پۆتینەکانم بدەیە •

ـ باشە چ لەو پەتـکە بـکەم ؟

ـ تۆ بێجگە لەو پەتکە بەردێکیشت دەوێ ، بەڵام بەرد لە وێ زۆرن •

ـ بـــەرد بۆچـــی ؟

ـ ئەحمەق ، تۆ خۆت ناتوانی ئەو تەرمە لێرە بەجێ بێڵی ؟

دەبێ ئەو پەتکەی تێخەی توو ، بەردێکی پێوە هەڵاوەسی‌و بیخـــەیە ناو چۆمەوە • ئەگەر وانەکەی سەر ئاو دەبێ • (ژان‌واڵژان) پەتکەکەی هەڵـگرت‌و (تناردیە) گوتی : زۆر باشە ئێستا بامامەلەکەمان تەواو بکەین‌و ئەوەی هەڵت گرتووە بەشی بکەین ، خۆ کلیلەکـــەت دی ؟ دە پارەکـــە ئاشکرا بکە • (ژان‌واڵژان) دەستی بۆ باخەڵ‌برد • وەك دەزانین عـادەتی وابوو هەمیشە پارەی پێ‌بوو ، بەڵام ئەوجارە نەکاتی گوڕینی لیباسە کانیدا دای نابوو • چاکـــەتەکەی هەڵتـەکاند دوو فرانك‌و یـەك لووی لێ کەوتە خوارەوە •

(تناردیه) لێوی خوارەوەی هەڵقرچاندو ملی باداو گوتی : ئەو پیاوەت هەر لەبەر ئەو نەختە پووڵە نەکوشتووە •

باخەڵی هەر دوکیـــانی پشکنی ، (ژانواڵژان) پشتی لەڕوناکیبوو بەرگری نەکرد ، لـەگیرفانی (مـــاریوس) (سی) فرانـــکی دەرهێنا ، (ژانواڵژان) چاوی لێنەبوو ، (تناردیە) کێردێکی لەباخەڵ دەر هێنـــاو پارچێکی لە چاکەتەکەی (ماریوس) کردەوەو دەباخەڵی نا • لەپاشـــان گوتی : بەڵێ ڕاستە بە دوو کەس سی فرانكو زیاتر پێ نیە ؟ بێ ئـــەوەی عەمەل بەقسەکەی خۆی بـکا هەمووی دەباخەڵێ ناو گوتی : زۆر باشـە گرنگ نیە ، من لەبەیانیەوە تا ئێستا ئێشکم گرتووە ، چونکە ئەو ڕۆژانەدا خەڵك خۆیان دەکەێنە ئەو زێرابەوە ڕادەکەن ، بەڵام هەرباشە چارە نیە• ئنجا کیلەکەی هێناو گوتی : ئێستا دەتوانی بچیە دەرەوە ، حـــەقی خۆت داوە • (ژانواڵژان) لەسەرخۆ (ماریوس)ی هەڵگرت و (تناردیە) دەرگای کردەوەو چوونە دەر • (تناردیە) دوبارە دەرگاکەی داخستەوەو بێ دەنگ بۆ کاسیەکەی دانیشتەوە ، چاوەڕوانی یەکیتر بوو • (ژانواڵژان) خۆی لەدەرەوە دێ •

## « ژاور لای وایە ماریوس مردووە »

ئەوان گەیشتبوونە قەراغ چۆمەکە • (ژانواڵژان) ( ماریوس )ی بێ هۆشی داناو ، داهاتەوە دەستیکرد بەئاو پێداکردن بەدەمو چـــاوی (ماریوس)دا • هەرچەند چاوی لەسەریێك نابوون ، بەڵام تۆزێك دەمـی لێك کردبۆوەو نەفەسی ئەداو هەناسەی دەهات • (ژانواڵژان) سەو لەنوێ دەستی گـەیاندەوە ئاوەکـە ، کـەچی لـەپڕ هەستی بەزەلامێك کرد لەپشتییەوە ڕاوەستا • ئاوڕی دایەوە ڕاستبوو ، ناسی ، (ژاور) بوو •

لەچاڵێك رزگاری بوو ، بەڵام کەوتە چاڵێکی فووڵترەوە • یەکەم جار (ژاور) ئەوی نەناسی ، چونکە وای‌خۆ گۆڕی‌بوو ، وەك خۆی نەدەچوو • (ژاور) دار حەیزەرانێکی بەدەستەوە بوو هەڵی دەسوڕاند پرسی تۆکێی ؟ وتی منم • - کێی ؟ - (ژانواڵژان) • (ژاور) بەڕقەوە حەیزەرانەکەی بەددان گرت‌و داهاتەوە دەستی لەسەرشانی (ژانواڵژان) داناو دەستی‌کرد بەتەماشا کردنی ، ئاخری ناسیەوە • (ژانواڵژان) بێ ئەوەی تەکانێك بدا گوتی : (ژاور)تۆ منت دیەوە ، بێجگە لەوەش لەبەیانیەوە دەمزانی دەبمە ئەسیری دەستی تۆ ، بۆیە ئادرەسی خۆم نەدا بەتۆ تا ڕابکەم من بگرە ، بەڵام پیاوەتی یەکم لەگەڵ بکە • دیاربوو (ژاور) گوێی لەو ووتانە نەبوو، چاوی دە (ژانواڵژان)ەوە بڕی بوو • ئاخری شانی بەرداو توند حەیزەرانەکەی بەدەستەوە گرت‌و پرسی لێرە چ‌دەکەی‌و ئەو پیاوە کێیە ؟

(ژانواڵژان) گوتی : ئاخر من سەبارەت بەو پیاوە ویستم قسە بکەم ، چۆنت پێ خۆشە ئاوا لەگەڵ من رفتار بکە ، بەڵام جارێ یارمەتیم‌بدە با بی بەینەوە ماڵێ ، داوای من لەتۆ هەر ئەوەیە • (ژاور) ڕەنگی گۆڕا ، دەسرێکی لەباخەڵ دەرهێنا داهاتەوە تەڕی‌کردو دەم‌و چاوی خوێناوی (ماریوس)ی پاك‌کردەوەو لە بەرخۆیەوە گوتی : دیارە ئەوە ئەو پیاوەیە کە لە سەنگەرەکەدا بە (ماریوس) ناویان دەبرد ؟ (ژانواڵژان) سەری ڕاوەشاندو (ژاور) نەزمی دەستی (ماریوس)ی گرت•

(ژانواڵژان) گوتی : بریندارە •

- دەڵێی مردووە ؟

- کەواتە لەسەنگەرڕا هێناوتە بۆ ئێرە ؟ (ژانواڵژان) گوتی :

- ئەو لە مارائیس - خیابانی کالور - لەماڵی باوکە گەورەی کە ناوەکەم لەبیرچۆتەوە دەژیا •

لەپاشان دەفتەرەکـەی (ماریوس)ی لەباخەڵ دەرهێناو دای بـە (ژاور) • (ژاور) وەری گرتو دور کەوتەوە • زۆری پێنەچوو جووت ئەسپی‌یەك نزیك بۆوە • (ماریوس)یان لەسەر لایەك داناو ( ژاور ) لەلای (ژان‌واڵژان) سواربوو ڕۆیشتن •

## « گەڕانەوەی کوڕە دەرکراوەکە »

نیوەشەو درەنگتر بوو ، عەرەبانە گەیشتە بەر دەرگای خـانووی ژمارە شەش لەخیابانی کالور • دانیشتوانی خانووەکە نووستبوون •

(ژان‌واڵژان)و سایقەکە (ماریوس)یان هێنایە خواروو (ژاور) لە دەرگای‌دا ، دەرکەوان هاتەدەرەوە ، (ژاور) پرسی : ئێرە ماڵی مسێو ژیل نورمـــاندە ؟

گوتی : بەڵێ • چ کارێـکت پێ‌یە ؟

ـ کوڕەمان هێناوەتەوە •

ـ دەر کەوان بەسەر سوڕمانەوە گوتی : کوڕەکە ؟

ـ گوتی : بەڵێ مردووە •

(ژان‌واڵژان) کەبە پەشێوی لەپشت سەری (ژاور) ڕاوەستا بوو بە ئیشارەی سەر دەرکەوانەکەی ئیشارەکرد ، کەوانیە نەمردووە • بەڵام نە لەقســـەی ( ژاور ) حاڵی بوو ، نە لەئیشارەکـــەی ئەم گەیشت • بەسەرسوڕمانەوە چوو خزمەتکارەکەی هەستاندو ئەویش (نیکولت)و ئەویش پووری ژیل نورماندی هەستاند • بەڵام ژیل نورماندیان ئاگادار نە کردەوە •

(ماریوس)یان بردە قاتی یەکەمو لەسەر تەختێك ڕایان کێشـــا •

خزمەتکارەکە چوو بەدوا دوکتۆردا • (ژانوالژان) هەستی کرد کە (ژاور) دەستی لەشانی‌دا مەعنای وایە بڕۆ دەر • لەپێش (ژاور)دا هاتە خوارێو بەجووتە سواری عەرەبانەکە بوون • (ژانوالژان) گوتی : ئاغای (ژاور) پیاوەتییەکم لەگەڵ بکە ، (ژاور) بەتوڕەییەوە پرسی : چی ؟

ـ لێم گەڕێ • بچمـــەوە ماڵو لەدوایە لە ئیختیاری تۆدا دەبم • (ژاور) چەند چرکە سەعات بێ دەنگ بوو ، لەپاشان یەخەی باڵتۆکەی خۆی هەڵکێشاو سەری لەعەرەبانەکە هێنایە دەرو بە سایقەکەی گوت : بێخوڕە بۆخیابانی آرمە ژمارە حەوت • کاتێ گەیشتە خیابانی (آرمـە) عەرەبانە ڕاوەستاو (ژاور)و (ژانوالژان) دابەزین • کوچە وەك هەمیشە ئارامو بێ دەنگ بوو • (ژاور) بەدوا (ژانوالژان)دا دەڕۆیشت •

کاتێ گەیشتە بەر دەرگای ژمارە حـــەوت (ژانوالژان) لـــە جەرەسی‌دا دەرگا کرایەوە ، (ژاور) گوتی : زۆر باشە بچۆ ژورەوە ، بەڵام منلێرە چاوەڕوانتم : (ژانوالژان) ئەوەی لە (ژاور) بـــە دور دەزانی تەماشایەکی کرد چۆ ژورەوە ، خزمەتکارەکەی هـــەستاند گوتی : مەترسە منم :

کە گەیشتە قاتی یەکەم هەلۆیستێکی کرد • پەنجەرەی دالانەکـە کرابۆوە • بەهـــەر نیازێك بوو چۆ بن پەنجەرەکـەو سـەری پـردە دەرەوە ، تەماشایەکی خیابانی کرد ، زۆری لا سەیر بوو • خیابان چۆڵ بوو • تەنانەت (ژاور)یش لەوێ نەما بوو •

# « باپیرو نەوە »

قەرەواش‌و خاوەن خانوەکە پەلاماری (ماریوس)ی بێ هۆشیان داو بردیان بۆ ساڵۆن دایانا • دوکتۆر هات دەستی کرد بە موعایەنەی • بووری ژیل نورماند وەخەبەر هات‌و هات • دوکتۆر برینەکانی دەرمان‌کردو لەسەر قەرەوێڵێك ڕایان کێشا • شانی زۆر بەخەرابی شکابوو • کاتێ دوکتۆر لە تەداوی بۆوە ، لەنکاو دەرگما کرایەوە ، پیاوێکی ڕەنگ پەڕیوی باڵا بەرز وەژور کەوت • باوکە گەورەی (ماریوس) بوو • چاوی بە نەوەکەی کەوت ، لەسەر قەرەوێڵە درێژ کراوەو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و لە خۆیندا شلاڵ بووە • لەتاوانی لەرزی‌و ئەژنۆی دوولا هاتەوە ، وەك گەچی سپی سپی بوو ، بەدەنگێکی لەرزاویەوە گوتی : (ماریوس) ؟

کارەکەرەکە بەمنجە منجەوە گوتی : ئاغا ئاغا هەر ئێستا هێنایان ، لەسەنگەر بووەو •••

باپیری بەدەنگێکی مەحزون گوتی : مردووە ؟

دوکتۆر سەری بەرداۆوە دەنگی نەدەکرد •

باپیری لێوی لەرزین‌و لەبەرخۆیەوە لەبەرخوا پاڕایەوە • لەو کاتەدا (ماریوس) لەسەرخۆ پێڵوە چاوەکانی بەرزکردنەوەو تەماشای کرد بەکزیەوە چاوی دەباپیریەوە بڕین •

باپیری گوتی : (ماریوس) کوڕی خۆشەویستم ! چاوت هەڵێناوە ؟ تەماشا من دەکەی ؟ ئەوە زیندوی ؟ ئۆخەی سەت شوکر بۆخوا • ئەوەی گوت‌و بێ‌هۆش‌کەوت‌و بەلادا هات •

# « چاو پۆشی ( ژاور ) »

(ژاور) لەسەرخۆ لەخیابانی (آرمە)وە رەدبوو ، سەری بەردابۆوە ، وردە وردە دەرۆیشت ، بۆ یەکـــەم جار لەژیانیدا دەستی دەپاش‌خۆوە گرتبوون • بەو رێــگا نزیکەدا رۆیشت کەدەچۆ سەر چۆمی (سین) • کاتێ گەیشتەوێ ، ئەنیشکی خستە سەر موحەجەری پردەکەو چـــاوی دە شەپۆلی ئاوەکەوە بڕی • نازاندرێ لەچ حاڵەتێدا بوو ؟ وەزیفەکەی لە پێناوی هەستی شەخسیدا کردبوو بەقوربانیو دەستی لەتاقیبی (ژان‌واڵژان) هەڵـــگرتبوو •

شتێك زۆر سەیر بوو بەهۆی سەر سوڕمانی ، ئەویش ئـــەوە بوو کە چۆن (ژان‌واڵژان) لەسەنگەری شۆڕشگێڕەکاندا ئەوی بەخشیو لـــە مەرگ رزگاری کرد ؟ ئێستا پێویستی سەر شانیەتی ئـــەو قـــەرزەی بداتەوە و (ژان‌واڵژان) ببەخشی •

لەکۆی بوو ؟ خۆی دەدی ، بەڵام دەستی نەدەکەوت • هەر وەك گوتم : ( ژاور ) لەســـەربردی ( سین ) ســـەری شۆڕ کردبۆوە تەماشـــا ئاوەکەی دەکرد • دنیا تاریك بوو ، هیچ دیار نەبوو ، هەستی بەسەرمـــاو ساردی کرد • باێیکی زۆر ساردی هەڵکردو چـــۆم غـــەزەبی گرت‌و شەپۆلی دەدان • چەند دەقیقەیەك بەو حاڵە لەوێ مایەوە •

ـ کردەوەی خەراپی خۆی •••

ـ ژیانی ڕابردوو •••

ـ چۆن ببوو بە باعیسی لەبەین بردنی ژیانی چەند کەس •

ـ هەمووی هاتنەوە یاد •

غەمێکی قووڵ دڵی گوشی‌و لەنـــکاو هەموو شتێك لەبەرچـــاوی ،

ڕەنگی بەدبەختی پیسی ، نەنگ‌و تەنیایی ڕێ نیشت • کلاوەکەی لـە گۆشێك دانا • لەپاش بەیتێك پەیکەرێکی بەرزو بۆر لەدورەوە دەتگوت : شەبەحی زەلامە هاتە سەر مەحەجەری پردەکــەو ڕوانیە چۆمەکە • لەپاشان کەوتە ناو ئاوەکە • چۆم شالاّوی هێناو قوربانی خۆی قووتداو هێواش بۆوە •

(ماریوس) ماوەیەکی زۆر لەبەینی مەرگ‌و ژیاندا پەلە قــاژەی کرد ، تا چەند حەفتە لەئاگری لەرزو تادا سووتاو ، بزرکاندی‌و ، ناوی (کەزیە)ی لەکاتی بێهۆشیدا دووپات دەکردەوە •

تەنانەت دوکتۆریش لێی کەوتبۆ شکەوەو چاوەڕوانی خـەراپتری لێ دەکرد • هەموو ڕۆژێ ، جاری وابوو ڕۆژێ دوو جــار پیاوێــکی بەرگ‌و لیباس جــوانی موو سپی دەهات ئەحــوالی ( مـاریوس )ی لەخانووەوانەکە دەپرسی‌و بەستێکی بۆ بەستن‌و پاككردنەوەی برینەکـەی بەجێ دێشت •

سەرەنجام لەحەوتی مانـگی کانوونی یەکەمدا ڕاست چـوار مانگ دوا ئەوەی هێنایانە ماڵی باپیری ، دوکتۆر گوتی : حــاڵی بەرەو باشی دەڕوا • بەلاّم دەبوو هەر لەسەر جێگابێ ، دوو مانگی خایاند تا شــانی گرتیەوەو چاك بۆوە • کاتێ چاك بۆوە ، دوبارە کەوتەوە یادی ڕابردوی، غەمەکانی هاتنەوە یادو ، کــەوتەوە یادی باوکی پونت مرسی‌و ، باپیری مسیو ژیل نورماندو دەیگوت : چونـکە باپیرم ئەوەندەی باوکم ناڕەحەت کردووە جێی هیوانیەو ، پشتی پێ نابەسترێ • (ماریوس) بەنەهێنی خۆی بۆ موبارەزە ئامادە دەکرد ، کەلەوانە بوو زوو تووشی ببێ •

لەوانە بوو ئەگەر بەئارەزوی وەلاّم نەدەنەوە برینەکانی بکاتەوەو لەوێ بڕوا ••• یان دەبوو (کەزیە) بۆ ئەو بێ ، یابمری •

رۆژێك مسیو ژیل نورماند لەکاتێکدا کچەکەی لەچێشت خانەدا خـــەریکی قاپو قاچاغ بوو • لــــە ( ماریوس ) نزیك بۆوەو زۆر بە میهرەبانی‌و لەسەرخۆ گوتی : چاوت لێیە کوڕم • ئەگەر من بوومایە لە جێی تۆ ، لەباتی ماسی گۆشتم دەخوارد • ئیتر ئێستا کاتی ئەوە هـــاتووە هەستی‌و پیاسە بکەیت‌و بای باڵی خۆت بدەی •

(ماریوس) هـــەستا لەسەر تەختەکەی دانیشت‌و لەباپیری ڕوانی‌و گوتی : دەم‌هەوێ شتێکت پێ بڵێم :

ـ چ شتێك ؟

ـ خەیاڵی ژن هێنانم هەیە •

ـ باپیری قاقا پێکەنی‌و گوتی : پێش بینیم دەکرد •

ـ چۆنت دەزانی ؟

ـ بەڵێ دەمزانی دەسگیرانەکەت دەبینی •

(ماریوس) کە زۆری لاسەیر بوو ، لەخۆشیان خەریك بوو باڵ بگری گوتی : ئاخ باوکە !

باپیری گوتی : ئۆخەی منت خۆش دەوێ ! تۆزێك بێ دەنگ بوون• ئنجا گوتی : زۆر باشە ئەو سەهۆڵە شکا پێی‌و وتم باوکە •

(ماریوس) سەری بەرزکردەوەو گوتی : باوکە ئێستا چاك بوومەوە، پێم خۆشـــە ببینم •

ـ گوتی : ئەوەشم پێش بینی کردووە ، بەیانی دەی بینی •

ـ ئەی بۆ ئەو ڕۆ نەی بینم ؟

ـ بۆ ئەوڕۆ ئەوەندە بەسە ، پێت گوتم : باوکە • ئەوە نرخی زۆرە•

ـ دڵت ئاسودە بێ بەیانی خۆشەویستەکەت دەبینی دێتە ئێرە •

(کەزیە)و (ماریوس) دوبارە یەکتریان دیەوە • لەدوا (کەزیە)وە پیاوێکی پیری بەعادەبی سەرسپی زەردە خەنەی لەسەر لیوان بوو ، دەتگوت : غەریبەیە هات لەپێش دەرگای ژوری (ماریوس) وەستا • ئەو پیاوە مسیو (فوشلونت) بوو ــ (ژانوالژان) بوو شتێکی گەورەی لەبن باخەڵدا بوو ، دەتگوت : کتێبە ؟

ژیل نورماند زۆری ڕق لەکتێب بوو ، لەخزمەت کارەکەی پرسی ئەو ئاغایە هەمیشە کتێبی لەباخەڵدایە ؟ گوتی : بەڵێ ئاخر مامۆستایە ، لەپاشان ژیل‌نورماند چۆوە بەردەمی مسیو فوشلونت گوتی : زۆر شانازی دەکەم بەوە کە (کەزیە) بدەی بە (ماریوس)ی کوڕم • مسیو فوشلونت گوتی : ئەوا دامێ •

ژیل نورماند بەخۆش حاڵیەوە هاتەوە لای (کەزیە)و (ماریوس)و گوتی : تەواو بوو • ئومێدەوارم خۆش بەختبن‌و پێکەوە پیرو خەرۆ بن • خۆشی بوو بەحاکم لەژورەکەدا • ژیل نورماندی نەوەت ساڵە ، وەك کوڕێکی چواردە ساڵە هەڵدە سوڕاو گوتی : ئای چەند لە دەسگیرانی کورەکەم ڕازیم ؟ چەند جوان‌و میهرەبانە •

ئنجا ووتی : ڕۆڵەکانم هەمیشە یەکترتان خۆش‌بوێ ، ئاخ هەرچی هەمە ملکەو هیچی ترم نیە ، تا نەمرم‌و نەی‌فرۆشن پارەتان نابێ •

( ژانوالژان ) گوتی : کچی من شەش سەت هەزار فرانکی جیهازی پێیە • (ژیل‌نورماند) چاوی دەرپەڕاندن‌و گوتی : شەش سەت‌هەزار فرانك ؟ گوتی : بەڵێ چواردە پازدە فرانك کەمتر •

(ژانوالژان) هەرهەستا ، بەستەکەی باخەڵی دەرهێنا ، کەژیل‌نورماند لای وابوو کتێبە ، لەسەر مێزەکەی داناو کردیەوە پێنج سەت‌و هەشتاو چوار هەزار فرانك بوو •

زیل‌نورماند پێکەنی‌و گوتی : چەند کتێبێکی باشە ، بەلاّم لـەو ماوەیەدا (کەزیە)و (ماریوس) هەر تەماشا یەکتریان دەکرد •

بێ‌گومان خوێنەرە بەرێزەکان لەیادیانە کە (ژان‌والژان) ئـەو پارانەی چۆن دەست کەوت ؟ کاتێ بوو بەرەئیسی شارەوانی شـاری (سورمر) لەپاش کارەسانی (شامب‌ماتیو) چۆوە (پاریس)و پارەکـانی لەبانقی (لافیت) هێنایەدەرو لەگەلّ شەمعدانەکانی ئۆسقۆفی ( دین )ی لەسندۆقێکی‌داردا لەجەنگەلّی (مونت‌فرمیل)دا شاردنیەوە • کاتێ پارەشی پێویست دەبوو ، دەچوو لێی دەردێنا • تا کاتێ (ماریوس) بریندار بوو ، زانی‌کە (کەزیە) دەخوازی ، چوو هێنایەوەدو پێنج سەت‌و هەشتاو چوار هەزاری دا بەوان پێنج سەتیشی بۆ خۆی هەلّگرت‌و لەدلّی خۆیدا گوتی: بۆ لەمەو دواش خوا کەریمە •• لەچنگ (ژاور)یش رزگاری بـوو ، چونکە رۆژنامەی (مونی‌تور) نووسی بووی (ژاور) لە چۆمی (سین)دا خنکاوەو تەرمەکەیان لە نزیك (پونت‌دوشان) دۆزیوەتەوە •

## « هەر دو پیرە (کەزیە)یان خۆش دەویست »

ئەوەی پێویستی ژن‌گواستنەوە بوو ئامادەکرا ، بەلاّم دوکتـۆر گوتی : باش وایە تا چـەند حەفتەیەکی‌تر سەبر بگرن • (ژان‌والژان) هەموو شتێکی حازرکرد • وەچونـکە ماوەیەك رەئیسی شارەوانی بوو دەیزانی چ دەکـا • هات لەقەیدو نفوسدا (کەزیە)ی کردە برازای خۆی‌و کردی بەکچی (فوشلونت)ی مەشهور کـەباغەوانی کلیسای (پتی‌بیکوس) بوو • پارەکەشی کردە ئی خزمێکی‌و گوتی : کاتی خۆی لای منیان داناوە ، تا کە هەرکاتێ (کەزیە) گەورە بوو بیدەمێ •

(کەزیە) تا ئەوکاتە هەر وەی دەزانی کچی (ژان‌والژان)ە ، ئەگەر زوتر بیزانیایە زۆر ناڕەحەت دەبوو ، بەڵام لەوکاتەخۆشەدا دەریەست نەبوو ، هەر بەباوکەی ناو دەبرد .

بڕیاریاندا کە (ماریوس) هـــەر لەمـــاڵی باپیری دابێو باپیری زورەکەی خۆی زۆرجوان بۆ ڕازاندەوە . لەبەر ئەوەی ( ماریوس ) لەدانشگای حقوق دەرچوو بوو بە بەڵێندەرو لە ژورەکـــەی باپیریدا دەستی‌کرد بەکارکردن .

## « نائومێدی تێکەڵاو بەشادی »

ئەو دو دڵدارە هەموو ڕۆژێ یەکتریان دەدی‌و (کەزیە) زۆر لـــە گەڵ (فوشلونت) دەچۆ ماڵی ژیل نورماند . (ماریوس) هـــەر بیری لێ‌دەکردەوە و نەی دەتوانی باوەڕکا کە ئایا ئەو پیرە هێمن‌و بەئەدەبە ئەوەیە کە چەند مانگ لەمەوبەر لەسەنگەردا دیویەتی ، یانا ؟ تا ڕۆژێك سەری قسەی دامەزراندو گوتی : ئەرێ بەڕاستی قەت چوویە خیـابانی (شانوری) ؟ مسیو (فوشلونت) سەری ڕاوەشاندوو گوتی : باوەڕناکەم ، تەنیا هەر ناوم بیستووە . (ماریوس) بێ‌دەنگ بوو گوتی : من چەند بێ ئەقڵم ؟ ئەوەی لەسەنگەر بوو ، هەر وەك ئەمە دەچوو ، چەند پیاوێـکی نازەنین بوو ؟

## « ئەو دو پیاوەی ون بوون »

هەر لەو ڕۆژانەدا کە تەدارەکی ژن هێنانیان دەگرت ( ماریوس ) دەستی دایە کارێـکی‌تر . ئاخر ئەو قەرزدار بوو ... هـەم لەلایەن

باوکیەوە و ، هەم لەلایەن خۆیەوە • لەلایەن باوکیەوە قەرزداری (تناردیە) بوو ، هەر وەهاش دەیویست ئەو پیاوەی لەسەنگەر رزگاری کردو هێنابووی بۆوێ بدۆزێتەوە •

تەنیا ئارەزوی دۆزینەوەی ئەو دووە بوو ، چەند کەسێکی بەکرێ گرتبوو ئەو دوانەی بۆ وەدۆزن ، کەس نەیزانی کێین و لەکوێن ؟ تەنیا سایقی عەرەبانەی چووت ئەسپییەکیان پەیدا کرد گوتی : بەڵێ ڕۆژێك پولیسێك منی بردە قەراغ چۆم و لەوێ پیرە مەردێك پەیکەری بریندارێکی گەنجی لە کۆڵ بوو ، لە کونی زێرابەکەوە هاتبۆ دەر ، سواری عەرەبانەکەم کردن و کوڕە گەنجەکەیان هێنایە ئەو خانووە ، لەپاشان پۆلیس و پیرە مێردەدەکە چوونە خانوێك لەخیابانی (آرمە) •

پیرە مێرد چۆ ژوورەوەو پۆلیسەکە بەپیادەیی ڕۆیشت ، لەو ڕۆژەوە نەم دیونەتەوە •

(داریوس) سەرسام ببوو ، دەیگوت : دەبێ ئەو پۆلیسە کێ بووبێ ؟ ئەی ئەو پیرەمەردە کێیە ؟

ڕۆژێك لای (ژانواڵژان) و (کەزیە) کارەساتەکەی شی کردەوە و گوتی : ئەو پیاوە گەورە لەبەر خاتری من گیانی خۆی خستە خەتەرەوە • می لەژێر ئاگری گوللەدا هەڵگرت و سەنگەری بەجێ هێشت و لەڕێگای کونی ژێرعەرزەوە ڕای کرد • ئەو وەك فریشتەی نەجات بوو ، بەڵام حەیف ون بوو نەم ناسی ؟

ئاخ ئەگەر ئەو شەش سەت هەزار فرانکەی (کەزیە)م دەبوو ؟ (ژانواڵژان) قسەی بڕیو گوتی : بۆ تۆ ؟ ـ بەڵێ هەمووم دەدایە ئەو کەسەی ئەو پیاوەم بۆ وەدۆزی • (ژانواڵژان) دەنگی نەکرد •

# « مارە بڕین »

شەوی شازدەی مانگی فەوریەی ساڵی (١٨٣٣) شەوێکی زۆر پیرۆز بوو • ئاسمان پێدەکەنی ، ئەستێرە تروسکەی چاوانیان دەهات ، شەوی مارەکردنو بووکو زاوایی (کەزیە)و (ماریوس) بوو • شەوی پێشوو (ژانواڵژان) بە ئاگاداری (ژیل نور ماند) پێنجصەتو هەشتاو چوار هەزار فرانکەکەی دەئیختیاری ( ماریوس ) نابوو ، چەند ڕۆژ لەمەوبەر (ژانواڵژان) قامکی کوترابوو ڕەش هەڵگەڕا بوو ، بەڵام موبالاتی پێ نەکردو لای کەس ئاشکرای نەکرد • تەنانەت نەشی بەست •

بەڵام لەئاخریدا وای تین بۆ هێنا ناچار بوو دەرمانی لێنێو هەڵی بەستی •

جا لەبەر ئەوە ، ئەو شەوە نەیتوانی دەفتەری مارکردنەکەی (کەزیە) ئیمزا بکا • (ژیل‌نورماند) لەجیاتی ئەو ئیمزای کرد • (کەزیە) لەوەختی مارەکردنەکەیدا زۆر خۆشحاڵ بوو ، لە پێستەکەیدا نەدەگونجا • لەدوا ڕەسمو یاسای مارەکردنو ئیمزای دەفتەری (کلیسا)و شارەوانی (ماریوس) بەرگێکی ڕەشی تاریکو ، (کەزیە) کراسێکی سپی لەبەردا بوو ، لە (کلیسا) هاتنەدەرو سواری عەرەبانە بوون ، لەکاتێکدا دەچوونەوە ماڵەوە دەیان چاو بەواق‌وڕمانەوە تەماشایان دەکردن ، ئەوەندە جوان بوون • (ژیل‌نورماند)و (ژانواڵژان) لەعەرەبانەکەدا ، لەبەرامبەر بووکو زاوادا سوار ببوون • ( کەزیە ) خۆی دەبن دەستی زاوا هەڵخزاندو گوتی : ڕاستە من بووم بەخانمی (ماریوس) ؟

ئەوان گەڕانەوە بۆ خیابانی (کالور)و دەستی یەکتریان گرتبوو ،

بە قادرمەکاندا سەرکەوتن‌و ، باوکی بووك‌و زاواش لەمـــلاو ئەولایان دەڕۆیشتن •

لەسالۆنی گـــەورەدا میوانـداری‌یەکی زۆریان کـــرد بوو • (ژان‌والژان) لەنزیك دەرگا لەسەر کورسیەك دانیشت • ( کـــەزیە ) بەپێکەنینەوە لێی نزیك‌بۆوە زۆر بەئەدەبەوە ڕۆژ باشی لێ کردو پرسی : باوکە گیان پێ‌خۆشحاڵی ؟

(ژان‌والژان) گوتی : بەڵێ زۆرم پێ‌خۆشە •

گوتی : کەواتە پێبکەنە • (ژان‌والژان) دەستی کرد بەپێکەنین • میوانەکان یەك لەدوا یەك هاتن دانیشتن • دوو کورسی لە ڕاست‌و چـەپی بووك دانرا بوون ، یـــەك بۆ ژیل‌نور ماندو یـــەك بۆ (ژان‌والژان) • ژیل‌نورماند هات دانیشت ، بەلاّم (ژان‌والژان) دیار نەبوو •

هەموو چاویان لە (ژان‌والژان) دەگێڕا دیار نەبوو • ژیل‌نورمـاند خزمەت‌کارەکەی بانگ‌کرد پرسی ئەوە مسیو (فوشلونت) لە کوێیە ؟
لەوەلاّمدا ووتی : قوربان بەمنی گوت : کەعەرزت‌بکەم ، کە دەستی ژان دەکاو ناتوانێ بێ نانتان لەگەڵ بخوا ، بی بەخشن ، گوتی : بەیانی زوو دێمـــە لاتان •

باوکی زاوا گوتی : زۆر چـــاکی کردووە بائیسڕاحەت بـــکا • (ماریوس) هەستە وەرە سەر کورسی مسیو (فوشلونت) دانیشـە •

(کەزیە)ش غەمی نەهاتنی باوکی لەبیرچۆوەو لەپاش چەند دەقیقـە پێکەنین‌و شایی دەستی پێ‌کرد ، جێگای مسیو (فوشلونت) خاڵی ••

# « ئەوەی لەبیر ناچێتەوە »

(ژان‌واڵژان) چـــۆوە ماڵێ‌و مۆمێکی هەڵـــکردو لەقادرمەکان سەرکەوت • ماڵ چۆڵ‌و هۆڵ بوو ، دەنـگی دەدایەوە ، هەموو سندوق‌و دۆڵاب کرا بوونەوە ، یەکسەرە چۆ ژورەکەی (کەزیە) جێگای خاڵی بوو ، ئاخری چۆ ژورەکەی خۆی ، مۆمەکەی لەسەر مێزەکـــە داناو دەستەکەی کردەوەو دەستی‌کرد بەئیش‌کردن دەتگوت : هەر دەستیشی بریندار نیە ؟ لەجێگاکەی نزیك بۆوە چاوی بەو جانتایە کـەوت کـــە هەمیشە هەڵی دەگرت‌و (کەزیە) حەسادەتی پێ دەبرد • ئەو جانتـــایە بوو کە لە رۆژی چواری حوزەیراندا کە هاتنە ئەو خانوە ، لـــەوێیی هێنابوو • هەڵی گرت‌و لەسەرخۆ کراسێکی دەرهێنا کـــە دەســـال لەمەوبەر ، کاتێ (کەزیە) لەشاری (فونت‌فرمیل) ڕۆیشت بـــە بۆنەی مردنی باوکی دابووی بە (کەزیە)و کاتێ چوو بوونە کلیسای (پیکوس) (کەزیە) دای‌نابوو ، ئەو بۆ یادگار خستبۆیە ئەو جانتایەوە • کە ئەوەی دی ، کـــەوتە بیرکردنەوەو یادی ڕابردو ، ئـــەو زستانە ســـاردەی کەوتەوە یاد ، ئەو ڕۆژە کـــە (کـــەزیە) منداڵ بوو ، پێخواس بوو ، لەسەرمان هەڵدە لەرزی ، ئەو کراسەی دایە تا لەبەری کا •

شتی ناو جانتاکەی بڵاو کردەوە ، چەند دەقیقە تێیان فـکری • کەوتەوە یادی ئەوکاتە کـــە ئەو لیباسانە پڕ بەبەری (کەزیە) بوون • ( کـــەزیە ) پێدەکەنی ، دەستی دەگرت لـــەو دنیایەدا ئەو نەبێ کـــەسی نەبوو •

لە نـکاو سەری وەپاڵە پشتەکەی کەوت • دڵی شکاو ناوچـاوانی گۆڕاو دەستی کرد بەگریان • فرمێسکی وەك دانەی مرواری لەچاوان دەبارین •

دەیگوت : تازە (کـــەزیە) و (ماریوس) هەموو شتێكو دارایی و سەروەتیان هەیە ، هەمووشی بەهۆی منەوە •

جـا ئێستا دەبێ چ بکا ؟ دەکرێ بچی لەلای ( کـــەزیە ) ژیان بەریتـە سەر ؟

ئەو شەوە تا بەیانی لەشـــەوی درێژی سەرمای زستاندا بـەو خەیاڵانەوە تلایەوە ، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە جارجار سەری دەبردە پێش و تەماشا جلەکانی دەکرد وەت دەزانی مردووە •

## « ئیعتیراف »

ڕۆژی دوا ژن هێنان هەمیشە موحتـــەرەمە ، بووك و زاوا ڕێزی خۆش بەختی خۆیان زۆر دەگرت :

بـــەیانی ڕۆژی حـــەفدەی مانـــگی فـــەوریە تازە خزمەت کارەکە وڵاتی گەسك دەدا ، لە دەرگایاندا • چوو دەرگای کردەوە چـاوی بە مسیو (فوشلونت) کەوت بردیە ژوری میوانان دەتگوت : مـــەیدانی مەحشەرو مەیدانی شەڕە • (ژانواڵژان) پرسی :

ئاغا هـــەستاوە ؟

ـ کام ئاغا ؟ ئاغای کۆن ، یان ئاغای تازە ؟

ـ مسیو پنت مرسی •

ـ بابچم بزانم هەستاوە دەڵێم : ئاغا (فوشلونت) تەشریفی هاتووە •

ـ نەء مەڵێ ئەو هاتووە بلێ یەکێك دەیهەوێ بە تایبەتی قسەت لەگەڵ بـکا ، ناوی کەس مەبە •

ـ ئەی بەچاوان چۆ دەرەوە •

دەنـگی کردنەوەی دەرگا هات • (ژانوالژان) سەری هەلبڕی (ماریوس) وەژور کەوت • زەردە خەندەی لەسەر لێوان بوو ، دیار بوو ئەویش ئەو شەوە نەخەو تبوو •

بە چاو پێکەوتنی (ژانوالژان) گوتی : ئەوە تۆی باوکە ! ئـــەو خزمەتکـارە ئەحمــەقە قــەت ڕاستی شت نالێ بەلام تۆزێك زوو هاتووی ، ئێستا سەعات نیوی پاش نیوەڕۆیە (کەزیە) لەخەو دایە •

دڵ ساردێیکی لەبەینی ئەو دوانەدا بوو بە ووتەی باوکـــە لـە لایەن (ماریوس)ەوە لەبەین چوو •

(ماریوس) گوتی : نازانی شەوێ دی جێگات چەند خالی بوو ؟ بەڕاستی دەستەکەت چۆنە ؟ ( کەزیە ) زۆری باس دەکردی ، زۆری خۆش دەوێی • باشـــە بۆنایە ئێرە پێـکەوە ژیان بەرینـە ســـەر ؟ (ژانوالژان) گوتی : ئاغا دەم هەوێ پێت بلێم : من بەندیەکی پیـری ناسراوم برینی دەستەکەی کردەوەو نیشانی (ماریوس)ی داو گوتی : دەستم قەت پریندار نەبووە ، هەر پیویست بوو لە ڕۆژی زەماوندەکەتاندا حـــازر نـــەبم ، لەقەستی گوتم : دەستم دێشێ ، تا بەدرۆ دەفتـــەری مارەکردنەکەتان ئیمزا نەکەم •

(ماریوس) زمانی لاڵ بوو گوتی : مەبەستت چیە ؟

ـ مەبەستم ئەوەیە کەمن زوو زیندانی بووم •

ـ تۆ خەریـکی من شێت کەی •

ـ ئاغای پونت مرسی من نوزدە ساڵ لەسەر دزی گیرام دوبارە هەر بەهۆی دزیەوە مەحکوم بەحەپسی ئەبەد بووم •

(ماریوس) لەوانە نەبوو شتی واقیعی قبوڵ نە کا ؟

بەڵام لەنــکاو بیرێك پەشۆکاندیو گوتی : بڵێ : بڵێ : کـــە باوکی ( کـــەزیە )ی !

(ژانواڵژان) گوتی : ئاغا هەر چەند باوەڕ بە سوێندی یەکێ وەك من ناکرێ ، بەڵام باوەڕکە هەموو قسەکانم ڕاستن •

لەحزور خوادا سوێند دەخۆم کەمن باوکی (کەزیە) نیم ، مـــن خەڵـکی ئاوایی (فارولز)مو بـــەگوڵ بەخێو کردن دەژیام ، نـــاوم (فوشلونت) نیە ، ناوم (ژانواڵژان)ەو هیچ پەیوەندیم بە ( کـــەزیە ) وەنیـــــە •

(ماریوس) هەنگاوێك هـــاتە دواوە پرسی : کێ ئـــەوەم بۆ ڕون دەکـــاتەوە ؟

ـ مـــن خۆم دەڵێم :

(ماریوس) بۆی دەرکەوت کە درۆ ئاوا ئارامو لەسەرخۆ ناگوترێ و گوتی : باوەڕت پێ دەکەم • (ژانواڵژان) سەری لەقاندو گوتی : من پەیوەندی یەکم بە (کەزیە)وە هەیە ، تا دەساڵ لەمەوبەر هەر نەمدەزانی وجودیشی هەیە ، بەڵام خۆشم دەوێ ، پیاوی پیر هەر عادەت وایە خۆی بەباوکی منداڵ دەزانێ • (کەزیە) نەباوکی بوو ، نە دایك ، پێویســـتی بەمن بوو ، بەڵام ئێستا بۆتە خانمی پونت مرسیو سەرپەرشتی کـــەری گۆڕاوە • پارەکەشم لە ڕێـــگای حەڵاڵەوە پەیدا کردووە • لـــەدوا ئەوە دە (ماریوس) فکریو (ماریوس)وا پەشۆکابوو ، چەند جار دەمی دەکردەوە قسە بـکاو بێ دەنگ دەبۆوە • ئاخری پرسی بۆ ئەوقســـانە بۆ مـــن دەکـــەی ؟

چی‌بۆتە هۆی ئەوە دان‌بەوە دابنێ ؟ ئەوە هەر لەدڵی خـــۆت

دابێ ، نەکەس تاقیت دەکاتەوەو ، نە تاوانباری • مـن زورم لاسەیرە ، لەبەرچی رازی خۆت ئاشکرا دەکەی ؟

(ژان‌والژان) لەسەرخۆ گوتی : لەبەرچی ؟ بەلێ هۆیەکـەی سەیرە ، لەبەر شـەرەفە • دەم توانی درۆبکەمو ئێوە فریو بـدەم و هەر مسیو (فوشلونت) بم • وەختێ خۆی لـەبەر خاتری (کـەزیە) درۆمدەکرد ، بەلاّم ئێستا پێویست ناکا • تۆ دەڵێی لەبەرچی ئاشکرای دەکەی ؟ ویژ دانم قبوڵ ناکا • زەمانێك بۆ ژیان نانێکم دەدزی ، بەلاّم ئیمرۆ بۆ ژیان ناوێك نادزم • (مـاریوس) قسەکەی پێ بڕیو گوتی : ژیان ؟ تۆ بۆ ژیان پێویستیت بەو ناوە نیە •

هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : دەزانم ، بەلاّم ئاغای (ماریوس) ئەوا ئەو ڕاستییەم نەگوتو هەر (فوشلونت) بوومو بەیانیان نەعلەکەم بەسەر پێوەکردو بۆ ناشتا خواردن هاتمە سالۆنو شەو سێ بەسێ چووینـە گەڕان بۆ باغی (توبلری)و لەنگاو یەکێك بانکی کردم (ژان‌والژان) •

ئەوکاتە پۆلیسی نەهێنی دەمگرنو ئاشکرا دەبم • تۆ دەڵێی چی ؟ بێ دەنـگی (ماریوس) وەلاّمی ئەو پرسیارە بوو • (ژان‌والژان) گوتی: ئێستا زانیت بۆچی ڕازی دڵی خۆم ئاشکرا کرد ؟

ئومێدەوارم هەمیشە خۆش بەختبی ، بەلاّم بەوە ناڕەحەت مـەبە کە زیندانیەکی بەدبەخت دەرگـای دڵی خۆی لەلای تۆ کردۆتەوەو وەزیفەی خۆی ئەنجام داوە •

ئاغای (ماریوس) ئەو پیاوەی لەبەرامبەر تۆ وەستاوە زۆر عەزیزو بەدبەختە • (ماریوس) دەستی گرتو گوتی : باوکی گەورەم مـن هاوڕێم زۆرن ئەمری عەفووت بۆ وەر دەگرم :

ـ ســـوودی نیه ، ئەوان من بە مردو دەزانن ، ئەوە بەســـە •
(ماریوس) لەدەرگـــا پێوە دراوەکەی ڕوانی‌و لە ژێر لێوەوە گوتی :
( کـەزیە )ی بێچارە ئەگـەر ئەوە دەزانی ؟ ئەو قســە تەواوی گیـانی
(ژانوالژان)ی خستە لەرزین‌و ڕوی‌کردە (ماریوس) گوتی : ئـاخ !
ەڵێ خەریـکی (کەزیە) حاڵی بکەی ؟ ئاغا تـکایە هیچ لـەو بابەتەوە
بە (کـــەزیە) مەڵێ • هەناسێکی هەڵـــکێشاو دەستی کرد بەگریان‌و
گوتی : بریا بمردمـایە •

(ماریوس) گوتی : ئارام بـگرە من ڕازی تۆ ئاشکرا ناکـــەم •
(ژانوالژان) گوتی : زۆر سپاست دەکەم ، زۆر باشە ئیتر هەموو شتێك
تەواو بوو ، تەنیا کارێك ماوە ـ چ‌کارێك ؟ لەسەرخۆ گوتی : ئایا ئێستا
تۆ کە لە مەوزوعەکە حاڵی بووی‌و بووی بە خاوەنی ( کەزیە ) لات
وایە ئیتر نابێ بیبینم ؟

(ماریوس) بەساردی وەلامی دایەوە بەڵێ نەی بینی باشترە ، چۆن
ناڕەحەت دەبێ ، نابێ ئەوە بزانی •

(ژانوالژان) چۆ لای دەرگاکەو لەبن لێوانەوە گوتی : کـــەواتە
ئیتر نابێ بیبینم ، دەرگاکەی کردەوەو گەڕایەوە بۆ لای (مـاریوس)و
گوتی : ئاغا حەقتە نابێ هیچ بە (کەزیە) بڵێم : بەلام دەکرێ جـار جـار
بەشـــەو بێمــە لای ؟

گوتی : هەموو شەوێك هەر سەعاتێك ویستت وەرە (کـــەزیە)
بەتەنیا چاوە ڕوانیت دەکـــا •

ـ ئاغـــا تۆ زۆر بوزورگـــەواری • بەخوشحاڵیەوە دەرگای
کردەوەو ڕۆیشت •

# « دڵۆپەی عەزاب »

(ماریوس) قامکی حیرەتی بەددان گەزت‌و بە دەریای خەیاڵدا چۆخوارێ • لەڕەفتارو کرداری ئەو (فوشلونت)ەدا حاڵەتێکی عەجیب‌و غەریب خۆی مەڵاسدا بوو •

ـ کەواتە ئەو مرۆڤە ناوی (ژان‌واڵژان)ە ؟

ـ کەشفی ڕازێکی سامناك لەو پەڕی خۆشی‌و خۆش بەختیدا ، وەك دۆزینەوەی دوپشك وایە لە هێلانەی کۆتردا •

ـ ئایا ژیان‌و خۆش بەختی (ماریوس) و (کەزیە) لێرە بەدواوە پەیوەندی بەسەر نویشتی ئەو پیاوەیەوە ؟

ئێستا مەبە ستێکی‌تر بۆ (ماریوس) ڕون بۆتەوەو زانیویەتی ئەوە ئەو کەسەیە کەهاتە سەنگەرو چۆ گەڵ شۆڕشگێڕەکان ، بەڵام تەقەی نەدەکرد • کەواتە بۆچی هات بۆ سەنگەر ؟

لەنکاو (ماریوس) (ژاور)ی کەوتەوە یاد کە لای شۆڕشگێڕەکان ئەسیر بوو ، (ژان‌واڵژان) گوتی : من دەیکوژم : دیارە ڕقیان لە یەکتر بووەو هەر لەبەر ئەو هاتبۆ سەنگەر • جا کەواتە (ژان‌واڵژان) بەعەمدی (ژاور)ی کوشتووە ؟ دەیان پرسیاری بێ وەڵامی وا هاتە خەیاڵ دانی (ماریوس)ەوە •

ڕۆژی دوایی کاتێ ڕۆژ تازە ئاوا دەبوو ، (ژان‌واڵژان) لە زەنگی ماڵی (ژیل‌نورماند)یداو خزمەت چیەکەیان دەرگای کردەوە ، بەچاو پێکەوتنی وی گوتی : ئاغا ویستی لێت پرسم داخوا پێت خۆشە بچیە قاتی سەرەوە ؟ یان لێرە چاوەڕوانی دەکەی ؟

- لێرە چاوەڕوانی دەبم :

خزمەت چی سەری لەقاندو گوتی : کەواتە هاتنی تۆ بەخـــانم دەڵێم : ئەو ژورەی کە (ژانوالژان) چاوەڕوانی تێدا دەکرد لەخوارەوە دوو کورسی لەنزیك مێزێکەوە تێدا دانرابوو ، فەرشێکی لێ ڕاخـــــرا بوو ، ژورێکی تایبەتی بوو .

خزمەتچی چوو مۆمێـــکی لەپێش زۆپاکە داناو چۆ دەرەوە . (ژانوالژان) سەری بەر دابۆوە ، لەنـکاو سەری بەرزکردەوە (کەزیە) لەپشت سەریەوە وەستا بوو .

زۆری تێفکری . (کەزیە) بەخۆشحاڵیەوە گوتی : ئەی باوکـــە چەند چاکت کرد هاتی ؟ ( ماریوس ) گوتی : خۆت پێت خۆش بووە لێرە بێمـــە لات ؟

- بەڵێ ڕاستە ، - ئاخ تۆ ناخۆشترین ژورت بۆ چـــاو پێـکەوتنی مـــن دیاری کردووە .

- دەزانی خانم ، من ئەو شوێنانەم زۆرتر پێ خۆشە (کـــەزیە) دەستە ناسکە بچوکەکـانی لێکداو گوتی : خانم ؟ مەبەستت چیـــە ؟ ( ژانوالژان ) زەردە خەندێکی هاتێو گوتی : تۆ خۆت پێست خۆش بوو بیـــە خـــانمو ، بووشی .

- بەڵام نەك بەنیسبەت تۆوە باوکە .
- ئیتر پێم مەڵێ : باوك .
- چی ؟
- یان بڵێ ژان - یاسیو ژان .
(کەزیە) بەسەرسامیەوە گوتی : من هیچ تێ ناگەم ئـــەو قسـانە

یەعنی چی ؟ مەگــەر ناڕەحەت بووی ؟ مەگەر خۆش بەختی منت پێ خۆش نیـــــە ؟

ڕەنــگی (ژان‌والژان) پەڕی‌و ماوەیەك وەڵامی نەدایەوە ، ئنجـــا وەك لەگەڵ خۆی قسە بــکا لەبن لێووە گوتی : (کەزیە) تۆ بەسەعادەتی خۆت گەیشتی‌و ئارەزوی منیش هەر ئەوە بوو •

(کەزیە) گوتی : ئۆخەی ئاخری بە (کەزیە) ناوت بردم • لەپاشان دەستی لەملی (ژان‌والژان) کردو (ژان‌والژان) گوتی : خانم من بەجێت دێڵم : چونــکە خزمەکان چاوە ڕوانیت دەکەن • چوو بۆ لای دەرگاکەو گەڕایەوە گوتی • بانــگم کردی (کەزیە) بەڵام بەمێردەکەت بڵێ : کە ئەوە جارێــکی دی دووپات نابێتەوە لێم ببوو رە •

(ژان‌والژان) چۆ دەرەوەو (کەزیە)ی بەمات‌و پەشۆکاوی بەجێ هێشت •

## « چەند هەنگاو بۆ دواوە »

ڕۆژی دوایی دوبارە لەهەمان سەعاتدا (ژان‌والژان) چوو بۆ لای (کەزیە) • بەڵام (کەزیە) نە بە باوك ، نە بە مسیو ژان ناوی نەبــــرد ، گوێی گرتبوو تا پیرە مێرد هەرچی لە دڵی‌دایە بیڵێ • لە وانەش بـــوو (ماریوس) مەوزوعەکەی پێ گوتبێ •

پیـــاو هـــەروا بە ئاسانی ناتوانی هێزی ئەوین شەرح بـــکا • (ژان‌والژان) هەموو شەوێك لەکاتی خۆیدا دەچوو بۆلای •

(ماریوس) کارێــکی وای‌کرد بوو ، کە لە کاتی هاتنی ئەودا لــە ماڵ نەبێ ، چەند حەفتە ئاوا تێ پەڕین •

(کەزیە) پێی نابۆ ژیانێکی تازەوە • خزمی تازەو عـــەیادەت و ئیشی ناو ماڵو سەیاحەت سەرگەرمیان کردبوو ، لەو ژیانە زۆر ڕازی بوو • خولاسەی هەموو خۆشیەکانیشی ئەوە بوو لەگەڵ (ماریوس) بێ •

(ژانوالژان) توانی دڵی (کەزیە) سارد بکاتەوە ، بەڵام ( کەزیە ) هـــەر خۆشی دەویست •

## « سەرنج ڕاکێشان »

لــە مانــگەکانی ئاخری بەهارو ئەووەلی هاوینی ساڵی (١٧٣٣)دا دراوسێکانی (ماریوس) هەمیشە پیرە مەردێکیان دەدی ، لیباسی ڕەشی پۆشی بوو ، هەموو شەوێك لەکاتی دیاری کراودا لەخیابانی (آرمە)وە ، سەر بەر دەداتەوەو ، بەغەمو پەژارەوە دێتە خیابانی (کالور) • بەڵام کە دەگاتەوێ ڕەنــگی دەگۆڕێو گەش دەبێتەوە • حاڵەتێکی زۆر غەریبی بوو دەتکوت : هەمیشە قسە لەگەڵ خۆی دەکا ، لێوی هەر دەجوولا • کاتێ دەگەیشتە پێش ماڵی (ژیل‌نورماند) ڕادەوەستاو چەند فرمێسکێکی هەڵدەوەراندن • وردە وردە لەچـــوون بۆ ماڵی ژیل‌نورماند کـــەمی کردەوە ، تەنیا دەیان دی کـــە تا نیوەی خیـــابان دێو تەماشای ماڵی (ژیل‌نورماند) دەکاو دەگری •

ژنی گەڕەك وەیان دەزانی شێتە • ڕۆژی بارانە چەتری پێ نەبوو، نەبارانو ، نە سەرماو گەرما نەیان توانی پێی تەرك بــکەن • منـــداڵ بەپێکەنینەوە دوای دەکەوتن •

هەر وەك ووتم : (ماریوس) لەپێش مارە کردنی (کەزیە) دا هیچ پرسیارێــکی دەر بارەی مسیو (فوشلونت) نەکردو لەدوا مارە کردنیشی

دوبارە لەوەزعی (ژانوالژان)ی نەکۆڵیەوە •

تەنیا ئەوەندەی لەتوانای دابوو هەوڵی دەدا لە هاتنی (ژانوالژان) بۆ ماڵیان بەرگری بکاو پەیوەندی نێوان ئەوو (کەزیە) بپچڕی‌و بۆی بکرێ یادی (ژانوالژان) لەسەری (کەزیە)دا نەهێڵێ • ( ماریوس ) لەدەرکردنی بەئەدەبانەی (ژانوالژان)دا چەند بەڵگەی بەدەستەوە بوو • نەی دەویست هاوسەرەکەی پەیوەندی بەو مرۆڤە جینایەت کارو دزەوە بێ‌و بێتە هۆی نەنگ‌و ڕیسوایی خانەوادەی •

ڕۆژێك (ژانوالژان) چوو لەسەر ئەو سەکۆیە دانیشت کەلە ڕۆژی پێنجی مانگی حوزەیران لەسەری ڕاوەستابوو ، چاوی بە (گاوروش) کەوت چەند دەقیقەیەك لەوێ مایەوە ، ئنجا هەستا چۆوە ماڵەوە • ڕۆژی دوایی لەژور نەهاتە دەرەوە ، ڕۆژی دوایی‌تر هەروا ••• حەفتەیەك ڕۆیشت نەهاتەدەر •

ئێستا هەر لەجێگادا بوو ، سەرا دارەکە بەژنەکەی ووت : ئەو پیاوە میهرەبانەی قاتی سەرەوە نە لە ژور دێتە دەرەو ، نە هیچ دەخوا ، فەقیرە بەو زووانە دەمرێ ، وابزانم لەدوری کچەکەی نارەحەتە ؟

ژنەکەی وەڵامی دایەوە گوتی : ئەو کرێچیە پارەی هەیە ، با دوکتۆر بێنێ ، ئەگینا بۆخۆی دەمرێ •

لەوکاتەدا چەقۆیەکی بەدەستەوە بوو ، لەناو باغچەکەیاندا لە بەرخۆیەوە دەیگوت : حەیف چەند پیرێکی میهرەبان بوو •

سەری بەرزکردەوە چاوی بەدوکتۆری گەڕەکەکەیان کەوت : بانگی کردو بردی بۆ لای (ژانوالژان) • دوکتۆر موعایەنەی کردو چەند کەلیمە قسەی لەگەڵ کردو هاتە خوارەوە • ژنی سەرا دارەکە

پرسی گوتی : دوکتۆر چۆنه ؟ گوتی : حاڵی زۆر خەراپە ، گوتی : چاوەڕوانی چی لێ دەکەی ؟ ـ چاوەڕوانی هەموو شتێك‌و هیچ شتێك ، وادیارە ئەو پیاوە دۆستێکی زۆر خۆشەویستی لەدەست داوە • ئەوەش نه خۆشی‌یەکە خەڵك پێی دەمرێ •

ـ دوکتۆر چی بەتۆ گوت ؟ ئایا تۆ دەگەڕێیتەوە ؟

ـ بەڵێ ، بەڵام یەکی تریشم لەگەڵ دێ •

شەوێك ( ژانواڵژان ) زۆر بەزەحمەت هەستایە سەرقوون‌و جمگەی دەستی چەپی خۆی گرت هەستی بەئێشانی دەستی نەکرد • هەناسەی بەزەحمەت دەهاتەدەر ، زانی کە لەجاران زەعیفتر بووە ، هەر چۆنێك بوو هەستا لیباسەکانی دەبەرکرد ، بەڵام تا لەبەری کردن چەند جار پشوویدا •

جا کە ڕۆژ بۆوە جانتاکەی کردەوە کراسی (کەزیە)ی دەر هێنا بلاوی کردەوە • شەمعدانەکانی (ئوسقۆف) لەپێش زۆپاکە بوون ، دوو مۆمی هێنان خستنیە شەمعدانەکان‌و هەڵی کردن •

هەر چەند ڕۆژی هاوین بوو زۆر ڕوناك بوو ، تەنانەت هەر لە ژوورێکدا باوبوو کە بەرۆژ مۆم هەڵکرێ کە جەنازەی تێدابێ • هەر هەنگاوێکی داویشت هەناسە بڕکێی وێدەکەوت ، ناچار دەبوو دانیشێ ، چوو لەسەر ئەوکورسی‌یە دانیشت کە لەبەرامبە ئاوێنەکە بوو ، ئەو ئاوێنەی کە هەواڵی مردنی ئەوو ، پەیامی شادی بۆ (ماریوس) هێنا • ئەو ئاوێنەی نامەکەی (کەزیە)ی لە خۆیدا نیشاندا •

خۆی لەئاوێنەکەدا دی ، بەڵام خۆی نەناسی‌یەوە ، تاژن هێنانی (ماریوس) کەس نەی دەگوت : تەمەنی لەپەنجا زیاترە ، بەڵام بەساڵێك

تەمەنی سیی ساڵ چۆ پێشەوەو چۆ تەمەنی واقیعی خۆیەوە •

کەشەو داهات زۆر بەزەحمەت مێزێکی ڕاکیشایە بەر زۆپاکـەو قەڵەمو دەواتێکی لەسەر دانا • لەپاشان بێ هۆش کـەوت • کـاتێ وەهۆش هاتەوە هەستی بەتینوایەتی‌کرد ، لەبەر ئەوەی نـەی توانی گۆزەکە بەرز کاتەوە ، خواری کردەوەو سەری پێوە نا • لەپاشـان تەماشایەکی کراسـە ڕەشەکەی (کەزیە)ی کرد • لەنـکاو تەزوێکی بەلەشیدا هات هەستی بە ساردو سەرما کرد • داهاتەوە قەڵەمەکـەی هەڵـگرت ، بەڵام لـەبەر ئەوەی زۆر لـەمێژ بوو پێیان نەنووسرابوو نووکەکەی بەپشتدا خواربۆودو مەرەکەبەکەش وشك ببۆوە ، ناچـار بوو ئاوی تێکا ، تا هەستا چـەند دڵۆپەی ئاو تێکرد سێ چوار جـار پشویداو ناچار بوو بەپشتی نووکی قەڵەمەکە بنووسی •

زو زو ناوچاوانی ئارەقی دەکردو دەی‌سترِی • دەستی دەلەرزی زۆر لەسەرخۆ ئەو چەند دێرەی خواردوەی نووسی •

ـ (کەزیە) دوعات دەگەیێنم : بابۆت شی‌بکەمەوە • مێردەکـەت حەقی‌بوو بەئەدەبەوە پێم بسەلمێنێ کە نابێ بێمە ماڵی ئێوە ، بەڵام لـە بڕێك مەوزوعیشدا سەهو بوو •

مێردەکەت پیاوێـکی باشـە . لەدوا مردنم زۆرت خۆش بۆی • (کـەزیە) ؟ دەزانم ئەو نامەت دەست دەکەوێ ، بزانە ••• لێـرەدا (ژانوالژان) ڕاوەستاو قەڵەمەکەی لەدەست کەوتە خوارو بێ ئیختیـار دەستی‌کرد بەگریان • هەر خوا ئاگادار بوو ، گوتی : ئیتر هەموو شتێك تەواو بوو ، تازە نای بینم : خۆزگە دەقیقەیەك : چرکە سەعاتێك دەم‌دی‌و گوێم لەدەنـگی دەبوو ، ئنجا دەمردم ؟ لەو کاتەدا لەدەرگایاندا •

هەمانرۆژ ، لەوکاتەدا کە (ماریوس) لەپشت مێزەکە هەستاو خەریکی پشوو دان بوو ، خزمەتکارەکە نامەیەکی دایەو گوتی : نووسەری نامە لەزوری چاوەڕوانی چاوەڕوانە • (ماریوس) بەپەلە زەرفەکەی دڕیو خوێندیەوە نووسرا بوو •

ئاغای (ماریوس) باڕون ، ئەگەر خوا حەزی بکردایە ئێستا منیش باڕون بوومو بانگیان دەکردم باڕون تناردیە ، بەڵام خوا نەیکردو مروڤێکی بەدبەخت زیاتر نیم : ڕازێکی زۆر گەورەم ئاگا لێیە ، پەیوەندی بەخێزانی تۆوەیە ، ئەگەر ئاشکرای بکەم : عارو نەنگی خانەوادەی تۆ دەسڕێتەوەو ڕاجیع بە لەدایك بوونو ژیانی کەزیە خانمە وەیە • چاوەڕوانی ئەمری بەڕێزتان لە گەل ڕێزو حورمەت • ئیمزا (تناردیە) (ماریوس) بەخزمەت کارەکەی گوت : ئەو پیاوە بێنە ژوورەوە چوو هێنای • کابرا سەری دانەواندو گوتی : چاوم لەهیچ یاداشتێك نیە تەنیا لە بەر خزمەت بەتۆ ئەوە دەکەم •

ـ قوربان دزوو پیاو کوژێك لە ماڵی تۆدا دەژی • ( ماریوس ) بەشۆکاو گوتی : لە ماڵیمن ؟ شتی وانیە •

کابرا کڵاوەکەی لەسەر کردەوەو بەفەقیانەکەی پاکیکردەوەو گوتی : بەڵێ دزو پیاو کوژ •

ـ من سەبارەت بە ڕابردو قسە دەکەم ، لە کارەساتێك دەدوێم کە لە دادگەری شاراوەیە •

ئەو پیاوە بە درۆ ، بەناوی نەهێنی خۆی کردووە بەیەکێك لـە خێڵی ئێوە ، بێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ بم با ناوە ئەسڵیەکەت پێ بڵێم : دەی گوێم ڕاگرتووە •

ـ ناوی ( ژانوالژان )ە •

ـ ئـەوە دەزانم •

ـ دوبارە ئامادەم بێ چاوەڕوانی پاداشت بڵێم : چ کارەیە •

ـ باشـــە قسـە بـکە •

ـ ئەو پیـــاوە زو حوکم دراوە •

ـ ئەوەش دەزانم •

ـ ئێستا کە من گوتم : زانیت ؟

ـ نەء لەپێشـــدا دەمزانی •

ئارامی (ماریوس) کابرای توڕە کردو بەسەرسوڕمانەوە گوتی : من فریو ناخۆم : ئاگاداریم لەسەر نەهێنی ئەو کابرایە زۆرە ، مـن نەبێ کەس ئاگادارنیە ، پەیوەندیان بە داهاتووی خێزانی تۆوەیە •

ئامادەم ئەو ڕوداوانە بە بیست هەزار فڕانك ئاشـــکرا بـــکەم •
( ماریوس ) گوتی : خۆشم دەیانزانم : کـــابرا گوتی : زەرەد ناکـەی دوو هـــەزار فڕانك بدە •

(ماریوس) گوتی : نەء ئەوەی تۆ دەیزانی منیش دەیزانم •

ـ بەڵام دەبێ ئیمڕۆ من نان بخۆم ، ئەوە نە هێنی‌یەکی تایبەتیە •

ئاغای باڕون دەبێ ئەو ڕازە ئاشکرا بکەم بیست هـــەزار فڕانك بەسە • (ماریوس) لێی ورد بۆوەو گوتی : ئەو ڕازەی تۆ وەك نـازی (ژانوالژان) دەزانمو ناوی تۆش دەزانم :

ـ ناوی مـــن ؟

ـ بەڵێ ناوی تۆ •

ـ ئەوە کارێـکی گرنگ‌نیە ، ناوی خۆم لەنامەکەدا نووسی بوو •

ـ دیـە •

ـ چی ؟

ـ تنـــاردیە کێیە ؟

(ماریوس) گوتی : ئەوە بوو گوتم : ئێستاش ڕازەکە بڵێم ؟ دەبینی لە تۆ ئاگادارترم :ــ ڕاستە (ژانواڵژان) دزو پیاو کوژە ، بەو مەعنـــایە دزە کە کارخانەی دەوڵەمەندێـکی بەنا ناوی مسیو (مادلن) فـــەرهود کردو نابووتی کرد • پیاو کوژیشە ، چونکە (ژاوەر)ی کوشت •

(تناردیە) خێسەیەکی لێ‌کردو ، لەپاشان زەردە ، خەنەیکی هاتێ‌و گوتی : ئاغای باڕون چەوت ئەڕۆی • (ماریوس) بەتوندی گوتی : چی؟ بۆ وانیە ؟ ئەو قسانە ڕاستن ؟

ـ ئاغای باڕون ئاگاداریەکەی تۆ ڕاست نیە ، ئینسان نابێ حەقیقەت‌و عەداڵەت ژێر پێ بخـاو مـن پێم خۆش‌نیـە خەڵك بە ناحـەق تاوانبار بکرێ • ئاغـای باڕون •

(ژانواڵژان) هەرگیز ماڵی مسیو (مادلن)ی نە دزیوە و (ژاوەر)ی نەکوشتووە •

ـ تۆ زۆر بەخاترجەمی قسە دەکەی لەکوێ دەزانی ؟ (تناردیە) گوتی : بۆ بە درۆخستنەوەی قسەی تۆ دوو بەڵگەم بەدەستەوەیە •

ـ ئەو بەڵـگانە چین ؟ بیان لێ •

تناردیه هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : یەکەم ( ژانواڵژان ) دزی لەمسیو (مادلن) نەکردووە ، چونکە خۆی مسیو (مادلن) بوو • (ماریوس) زۆری لاسەیر بوو گوتی :

ئەوە مەعنای چی ؟

ــ دووەم ئەو ( ژاور )ی نەکوشت ، چونکە ( ژاور ) خودکوشی کــرد •

ــ من سەرم لەوە دەر ناچێ ؟ بەتۆڕییەوە گوتی : ڕونی بکەوە ، ڕونی بکەوە • (تناردیە) پاکەتێکی گەورەی لە باخەڵ دەرهێناو گوتی : بەڵگەم هەیە •

دوو ڕۆژ نامەی زەردی قەراغ دڕاوی لە پاکەتەکە هێنانە دەرێو بڵاوی کردنەوەو گوتی :

ئەوانە بەڵگەی قسەی منن •

یەکەمیان لەبەرواری بیستو پێنجی حوزەیرانی (۱۸۲۳)دا ، هەواڵی (ژانواڵژان)و (مادلن)ی بڵاو کردبۆوەو ، دووەمیشیان ڕۆژ نامەی (مونی‌تور)ی پازدەی حوزەیرانی (۱۸۳۲) بوو ، خەبەری مەرگی (ژاور)و بەسەرهاتی (ژاور)ی تێدا بوو ، نووسی بووی ••

(ژاور) بە پۆلیسی ڕاگەیاندووە کە دەستەیەك لە شۆڕشگێڕەکانی گەڕەکی (شانوری) دەستگیریان کردو ، خەریك بوون بی‌کوژن • بەڵام یەکێك لەشۆڕشگێڕەکان گیانی کڕیوەتەوە ، بەناوی کوشتنەوە بردویەتی بۆ پشتی سەنگەرو ، لەوێ دەستو قاچی کردۆتەوەو ، ئازادی کردووە ، بۆ ئەوەی وابزانن کە کوشتویەتی ، تفەنگێکی بەحەوادا هەڵتۆقاندووە •

(ماریوس) که ئەوەی خوێندەوە لەپڕ هەموو شتێکی بۆ ڕون بۆوەو زانی کە یەکەم ئـــەو ڕۆژە (ژانوالژان) لە سەنگەری (شاندروی)دا (ژاور)ی نەکوشتووەو چەند ڕۆژ لەدوا ئەوە تەرمی (ژاور)یان لەچۆمی (سین)دا رۆزیەوە ، خودکوشی کردبوو ، خنکابوو ، کەواتە دیارە کـە (ژانوالژان) ئەی کوشتووە •

لەبابەت حەقیقەتی مسیو (مادلن) و (ژانوالژان) یشەوە بەدوورو درێژی نووسرا بوو ، ڕاستی قسەکەی تاردیەی ئاشکرا دەکرد •

(ماریوس) بەزانینی ئەو ڕازە ئاگـــای لەخۆی نەما ، هـــەستاو بەخۆشیەوە هاواری کرد ـ ئاخ کەواتە ئـەو پیاوە بێچارە پیاوێـــکی عەجیبە • ئەو هەمان مسیو (مادلن)ی سەرۆکی شارەوانی خۆشەویستە !

(ژانوالژان)ی رزگار کەری (ژاور)ە ـ قارەمانە ـ فریشتەیە !

(تاردیه) هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : نە قارەمانەو ، نە فریشتە ، دزوو پیـــــاو کوژە •

وشەی دزو پیاو کوژ وەك ئاوێك هەستی (ماریوس)یان ســـــارد کردەوەو گوتی : دوبارە ؟

تاردیه) گوتی : بەڵێ ڕاستە دزی لەمسیو (مادلن) نە کردووە ، بەڵام هەر دزە • ڕاستە (ژاور)ی نەکوشتووە ، بەڵام هەرپیاو کوژە •

(ماریوس) زۆر بەبێ سەبری گوتی : مەبەستت پێ دزی ئەو تیکە نانەی چل ساڵ لەمەوبەرە ؟

ـ نەخەیر سەبارەت بە ڕوداوی ئەو دوایە قسە دەکەم : ئـەوەی ئێستا ئاشکرای دەکـەم زۆر نەهێنیە •

ـ ئاغای (باڕون) ڕۆژی شەشی حوزەیرانی (١٨٣٢) ڕاست سالێك لەمەوبەر پیاوێك لەکونی زێرابی (پاریس)دا لە نزیك ئەو جێگایەوە کە دەچێتە ناو (سین)ەوە ، خۆی شارد بۆوە •

لەنـکاو (ماریوس) کورسی یەکەی بردە پێشەوە ، (تناردیە) چاوی لێ بوو ، هەستی پێ کرد کـــەمەوزوعەکە پەیوەندی بە ( ماریوس )و (کەزیە)وەیە ، بەپەلە درێژەی پێداو گوتی : ئەو پیاوە لەبەر چـــەند هۆی سیاسی ئەو ژێرزەمینەی کردبوو بە پەنا گاو ڕۆژانی ئاشوب لەوێدا درێژەی بە ژیان دەداو کلیلی زالکی کونەکەشی پێ بوو •

ـ دوپاتی دەکەمەوە ، کە ئەو کارەساتە لەسەعات هەشتی شـەوی شەشی مانـگی حوزەیراندا ڕوی داوە •

ئەو پیاوە بەتاقی تەنێ لـــەو کونە سامناك و کەسیفەدا دانیشتبوو ، لەنـکاو دەنگێکی لەژێرابەکەدا بیست ، زۆر بەپەشۆکاویەوە خـــۆی پەناداو گوێی هەڵخست ، دەنـگی زەلامێکی هاتە بەرگوێ ، بەهـــۆی ڕوناکی زالکی کونەکەوە زانی کە یەکێك بەرەو ڕوی دێ و ناسی کـــە ئەوە پیاوێـکی پیرە ، شتێکی لەکۆڵە ، پشتی چەماندۆتەوە ، ئەو پیـاوە پیرەش مەحکومێکی لەمێژینە بوو ، کۆڵەکەشی جەنازەیەك بووە •

زۆرباش ئەوە ڕون بۆوە کە پیاو کوژ بووە •

با بگەڕێینەوە بۆ سەر دزیەکەی • ئینسان لە خۆڕا پیاو ناکوژی ، دەی ویست بیخاتە ئاوەکەوە ، چونـکە نەدەکرا لە کونەکـــەدا بەجێی بێلێ ، ئاشکرا دەبوو •

ـ من سەرم لەوە سورماوە کـــە چۆن توانی بەو کۆڵە گرانەوە گیان بەسەلامەتی لەو کونە دەر بەری ؟

(ماریوس) کورسی‌یەکەی زیاتر بردە پێشەوە • (تناردیە) تۆزێك پشووی داو گوتی : ئاغای بارون ، بەهەر حاڵ ئەو پیاوە پیرە بەکابرای ناو کونەکە دەڵێ : تەماشا چم لـــە کۆڵە ؟ کلیلەکەم بدەرێ با بچمـە دەرەوە •

ئەو پیرە تاقەتێکی خەرق‌ولعادەی بوو ، نـــە دەکرا لـەو جێـــگا چۆڵەدا قسەی ڕەد بکرێتەوە ، کابرای کلیل بەدەست دەی‌ویست بـــی خافڵێنێ ، چوو تەماشا جەنازەکەی کردو ، بێ ئەوەی کوژەر بزانی بـە چەقۆ پارچێکی لەکۆتی کوژراوەکە کردەوەو دەگیرفانی نا •

ئەو پارچەی بۆ بەڵـگە هەڵگرت • لەدوا ئەوەی دەرگاکە کرایەوە پیرە ، تەرمـــەکەی هەڵـــگرت‌و رۆیشت • کابرای کلیل داریش بە ترسەوە دەرگاکەی لەژورەوەڕا داخست بۆ ئەوەی کە خستیە ئاوەکەوە چـــاوی لێ نەبێ •

بەڵێ ئەو پیاو کوژە (ژان‌والژان) بوو ، خاوەن کلیلەکەش ئەوەتا قسەت لەگەڵ دەکاو ئەوەش پارچەی کۆتی کوژراوەکەیە ، دەســـتی دەگیرفانی ناو پارچێکی خوێناوی هێنایە دەر • (ماریوس) ڕەنگی ڕوانی بەڕی‌و هەناسەی وەستاو چاوی دە پارچەکەوە بڕی‌و بەو حـــاڵەتە کشایەوە دواوەو گەنجینەکەی کردەوە •

(تناردیە) پارچەکەی هەر بەدەستەوە بوو گوتی : بەڵێ جـــەناب وتـم : بێ گومـــان پوولی زۆری پێ بووە ، بۆیـــە (ژان‌والژان) کوشتویەتی ؟ ئەو پیاوەی کچەکەت مارە کردووە دزە ، پیـــاو کوژە ، ئەوەی عەرزم کردی گرنگ نەبوو ؟ ئەی پاداشتەکەی ؟

(ماریوس) کۆتێکی ڕەشی لەگەنجینەکە دەر هێناو هاواری کرد ـ

کوژراوە کە من بووم ، ئەوەش ئـــەو کۆتەیە کـــە تۆ پارچەکـــەت لێ کردەوە • بەتووندی پارچەکـــەی لە دەست (تاردیە) فڕاندو بەجێی براوەکەی گرت بە ئەندازەی وی بوو • (تاردیە) حەبەساو لەجێـــگای خۆی وشك بوو • •

(ماریوس) هـــەراسان بوو دەلەرزی ، دەستی دەباخەڵ ناو بە توڕەییەوە بۆ لای تاردیە ڕویشتو هەزار فڕاتـکی بۆ هەڵداو گوتی : تۆ پیاوێـکی حۆقەبازی ، دزو پەستی ، تۆ هاتی ئەو پیاوە شەریفە عەیب دار کەی ، بەڵام گوناحەکانت سڕینەوە •

دەتویست ئەو بەخەراپ لەقەڵەم دەی ، بەڵام گەورەت کرد • ئەوە تۆی دزو پیاو کوژی • (تاردیە) • من تۆم لەپەرنجەرەڕا چاو لێ بوو ، کە لە گەڵ کۆمەڵێك پیاو خـــەراپ خەریك بوون ( ژانواڵژان ) بکوژی ، ئەوەندەم بەڵگە لەسەر خـــرایی تۆ بەدەستەوەیە دەتوانم : فەوری بە گرتنت بدەم •

بگرە بەدبەختی فێڵباز ئەو هـــەزار فڕانـــکەو لەپێش چاوم ون بـــەو بڕۆ •

دەبێ بەیانی زو بڕۆی بۆ ئەمەریکا ، لەگەڵ کچە چووکەکـــەتو ژنەکەت ، چونکە کچەگەورەکەت مردووە ، ئەی دزی دەغەڵباز مـــن خۆم سواری کەشتیت دەکەمو بیست هەزار فڕانکت بۆ ئەدەم •

(تاردیە) سپاسی کردو گوتی : جەنابی (بارۆن) بەقەت یەك دنیـا مەمنونم : ئارەقی کردبوو چۆ دەرەوە •

لەپاش دوو ڕۆژ چۆ ژوری کچەکەی ـ (آرلما) بە ناوی نەهێنیو بەچاو دێری (ماریوس) سواری کەشتی بوو ، بیست هەزار فڕانکەکەی

وەرگرتو بەرەو (نیویورك) کەوتنە ڕێ • بەڵام ئەو ڕۆژە کەئەڕۆیشت (ماریوس) بەهەڵەداوان چوو هاواری کرد ـ (کەزیە) ـ (کەزیە) ! زو کـــە وەرە بڕۆین •

(کـــەزیە) لای وابوو تووشی ماخولیا بووە ، بەڵام بێ ئـــەوەی قسەیەکی لەدەم دەرچێ بەقسەی کرد •

ـ ئادەی (باسکو) عەرەبانێك حازر بکە • (کەزیە) وەرە ! ئـەی خوای گەورە ! ئەوە ئەو بوو گیانی منی رزگار کرد ! (کەزیە) زو کە با بڕۆین ! عەرەبانە لەبەردەرگا حازر بوو ، سوار بوونو بەعەرەبانەچی گوت : زو بڕۆ بۆ خیابانی ژمارە حەوت ، کابرا پێی پێوە نا •

(کـەزیە) بەخوشحاڵی گوتی : ئۆخەی چ سەعادەتێکە ، خیـابانی (آرمە) ؟ من نەم دەتوانی لەو بابەتەوە قسەت لەگەڵ بکەم : ئۆخـــەی ئەوە دەچین بۆلای مسیو ژان ؟

نەخەیر (کەزیە) ئەوە دەچین بۆلای باوکت • ئێستا حەقیقەتم بۆ ڕون بۆ تەوە • تۆ گوتت : ئەو نامـــەی بە (گاوروش)دا بۆم ناردی هەرگیز پێم نەگەیوە ، بێ گومان وەدەست باوکت کەو تبوو •

(کەزیە) گیان ئەو چۆ سەنگەر تا گیانی من رزگار بکا • ئـــەو فریشتە بوو • (ژاور)ی رزگار کرد • منی لەزاری مەرگ رزگـــار کرد ، من بێهۆش بووم ، ئەو گیانی خۆی خستبۆ مەترسییەوە ، مـن لەوکـاتەدا نەهیچم ئەدی ، نە هیچم دەویست ، بەڵام زۆرم خـــەرابە لەگەڵ باوکت کرد ، ڕوی ناخۆشم نیشانداو پێم لەو ماڵە بڕی •

ئێستا دەچین دەی هێنین بۆ لای خۆمان • (کـەزیە) ـ (کـەزیە)

خۆزگــه وەمان دیایە ؟ تاماوم ئاگاداریم دەکردو دەت بینی چـۆنی دەپەرستم ؟

## « شەوان ڕۆژیان لە دوایە »

(ژانوالژان) گوێی لەدەنـگی دەرگـا بوو ، بەهێواشی گوتی : وەرنە ژورەوە • دەرگا کرایەوە (کەزیە)و (ماریوس) وە ژور کەوتن• (کـەزیە) چۆ پێشـەوەو (ماریوس) پاڵی بـە دەرگاکەوەدا • (ژانوالژان) لەخۆشیان چاوی ڕوناك بوونەوە ، ویستی لەجێگاکەی بێتە دەرەوەو هەستی دانیشی ، بەدەنـگی کزەڵۆکانەوە گوتی : ( کەزیە ) ! (کەزیە) خۆی دەباوەشێ هاویشتو گوتی : باوکە ! ( ژانوالژان ) بەلەرزینەوە گوتی : (کەزیە) ! ئەوە تۆی ؟ خانم ؟ (کەزیە) تۆی ؟ ئەی خوای من ! کەواتە لێم خۆش بوی ؟

(ماریوس) لەترسی فرمێسك هەڵوەراندن چاوی لەسەرێك ناوو ، لە نکاو چۆ پێشەوە بەگریانەوە گوتی : باوکە !

(ژانوالژان) گوتی : تۆش حەفووت کردم ؟ (ماریوس) توانای وەڵام دانەوەی نەبوو (ژانوالژان) گوتی : سپاست دەکەم : ( کەزیە ) بەچۆکدا هاتو دەستیکرد بەماچکردنی موەە سپیەکانی •

(ژانوالژان) لەبەر خۆیەوە دەیگوت : چەند بێ عـەقڵ بووم ، وەمدەزانی ئیتر نای بینمەوە ؟

هەر بەچاو پێکەوتنی کراسەکەی دڵم خۆش بوو •

(کەزیە) سـەری بەردایەوە گوتی : چەند ناخـۆش بوو بەجێت هێشتین ! لەو ماوەدا لەکوێ‌بووی ؟

ئاخ ئەو باوکە بێچارەم نەخۆش بووەو ئێمە نەمان زانیوە . (ماریوس) وەرە دەستی بگرە چەند ساردە ؟

(ژانوالژان) دوبارە گوتی : (ماریوس) تۆش هاتی ؟ منت عەفوو کرد ؟ (ماریوس) ڕوی کردە . (کەزیە)و گوتی : گوێت لێ بوو ؟ ئای چ باوکێکت هەیە ؟

ئەو هەموو چاکەی لەگەڵ کردووم ، ئەو تۆی دابە من ، ئەو گیانی منی نەجاتدا ، ئەو خۆی کردە قوربانی . (کەزیە) ئەو باوکەت فریشتەیێکە !

ڕوی کردە (ژانوالژان)و گوتی : ئاخر تۆ بۆ بەمنت نەگووت : خۆشت تاوانباری ، ئەوەی لەدڵتدایە نای درکێنی . ( ژانوالژان ) گوتی : ڕاستیم گوتووە .

ـ نە، تۆ ڕاستیت نەووت ، تۆ مسیو (مادلن) بووی ، بە منت نەگوت : گیانی (ژاور)ت رزگار کرد ، دەنگت نەکرد ، گیانی من قەرزداری تۆیە ، وەڕوت نەهێنام ئاخر بۆ ؟

هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : ئاخر ئەگەر کارەساتی زێرابەکەم باس بکردایە دەتگوت : دەبێ لەلای ئێمە وەمێنیو دەبوومە باعیسی نەنگی ئێوە .

ـ ئاخ بەسە ، ئیتر دەتبەینە لای خۆمان ، هەر تا بەیانی لێرەی .

(ژانوالژان) گوتی : بەیانی نە لێرە دەبم و ، نە لەماڵی ئێوە . (ماریوس) پرسی مەبەستت چیە ؟ لەوە زیاتر نا هێڵین لێمان جیاوەبی .

لەنکاو (کەزیە) هاواری کرد ـ باوکە دەستت سارتر بوون ، ئەوە حاڵت باش نیە ؟ ناڕەحەتی ؟

نەء زۆرباشم ، بەڵام • بێ دەنگ بوو • ( کەزیە ) پرسی بەڵام چی ؟ تاچەند دەقیقەی‌تر دەمرم •

(کەزیە) و (ماریوس) لەرزین‌و (ماریوس) لەبەرخۆیەوە گوتی : دەمری ؟ ـ بەڵێ بەڵام گرنگ نیە •

ـ باوکە ! باوکە تۆ نامری دەبێ بژی • (ژان‌والژان) دە (کەزیە)ی‌ە ڕاماو گوتی : ئاخ مەهێڵە بمرم : کێ دەزانی ؟ بەڵکو بەقسەت بکەم ••• کاتێ هاتیە ژورەوە خەریك بوو بمرم •

(ماریوس) گوتی : زۆرباشی ، لات‌وایە مرۆڤ ئاوا دەمری ؟ لەنکاو دەرگای ژورەکە کرایەوە دوکتۆر هاتە زورەوە ، دەستی گرت‌و ڕوی‌کردە (کەزیە)و (ماریوس) گوتی : پێویستی بە ئێوەیە •

دوکتۆر سەری بردە بن‌گوێی (ماریوس)و گوتی : بەڵام زۆر درەنگ هاتن : ( ژان‌والژان ) تەماشای کردن‌و لە نکاو هەستا • زۆر جاری‌وایە لەکاتی مردندا ئەو هێزە دێتەوە بەر ئینسان •

بێ ئەوەی بێڵێ دەستی بگرن هات بۆلای دیوارەکەو ، (صەلیبێك) بەدیوارەکەوە بوو لێی کردەوەو زۆر بە پێ‌خۆشحاڵی بۆ لای تەختەکەی خۆی گەڕایەوەو دانیشت‌و ، دە (سەلیبە)کەوە ڕاما •

لە نکاو سەری بەپێشەوەدا بەر بۆوەو خەریکی گیان دان بوو • دوبارە هاتەوە سەرخۆو سەری بڵندکردو فەقیانەکەی (کەزیە)ی ماچ‌کرد •

دوکتۆر چۆ پێشەوەو پرسی پێت‌خۆشە قەشە بانگ کەین ؟

ئیشارەی بۆ ئاسمان کردو گوتی : من (قەشەم) هەیە ، ئەو کاتەدا

قەشەی لەسەر سەری خۆی دەدی • لەوانە بوو ، وابزانێ (ئۆسقوف) لەتەنیشتی ڕاوەستاوە •

(کەزیە) بەئارامی باڵنجێکی لەپاش پشتی دانا ، هەر دەهات و زەعیف تر دەبوو • هەناسەی تەنگ تر دەبوو • بەدەست ئیشارەی کرد ـ نزیك وەبن و گوتی : ڕۆڵەکانم زۆرم خۆش دەوێن • (کەزیە) چەندت میهرەبانی نواند ؟ ئەو پشتی یەت لەپشت دانام • (کەزیە)ی جوان ،کە مردم زۆر مەگری، باغەمگین نەبی • دوو شەمعدان لەپێش کورەکەن بۆ تۆ ، هەر چەند زیون ، بەڵام لای من ئاڵتونن • ئەڵماسن • نازانم ئەوەی دانی بە من لەئاسمان لێم ڕازیە ؟ یان نا ؟ خۆ من ئەوەی لەتوانامدا بوو کردم • ڕۆڵەکانم : لەبیرتان نەچێ ، من پیاوێکی هەژارم ، لەفەقیرترین شوێن کەمردم بمنێژن و کێلم بۆدانێن ، بەڵام هیچی لێ مەنووسن •

ئەگەر جار جار بێنە سەر گۆڕەکەم دڵم پێخۆش دەبێ • (ماریوس) (کەزیە) بەتۆ دەسپێرم • لاجانگە جوانەکانی گەزهەری دڵخۆشی من بوون • کە گەش نەدەبوون غەمبار دەبووم • پێنج هەزار فرانك لەگەنجینەکەدایە ، دەستم لێ نەداوە ، ڕۆڵەکانم ئێمە خۆش بەخت بووین •

من ناچمە شوێنێکی دوور هەر دەتان بینم : (کەزیە) وەختی ئەوە هاتووە ناوی دایکت بڵێم : ناوی (فانتین) بوو ، کەناوی دایکت هاتە سەر زار ، بەچۆکداوەرەو سوجدە بەرە ، ئەوەندەی ئەوبەدبەخت بوو ، تۆ ئەوەندە خۆش بەختی •

ڕۆڵەکانم : وەرنە پێشەوە بادەستو بەسەردابێنم : (کەزیە) و (ماریوس) بەچۆکدا هاتن و وەك دوڕ فرمێسکیان بەچاواندا دەهاتنەخوارە هەریەکەی دەستێکی (ژان والژان) یان گرتبوو ، ماچیان دەکردو مرد •

له گۆڕستانی (پرلاشز) دور لەگۆڕی ڕازاوە • لەگۆشێکی دور لە نزیك دیوارە کۆنەکە ، لەژێر سەوزە گیای چرو پڕدا بەردێکە ئەو بەردە وەك هەموو بەردی گۆڕەکانیتر پەیکەرێکی دا ڕۆشیوە ، هەوا ڕەشی کردووە ، ئاو سەوزی هەلگێڕاوە • جادەی لێ نزیکە ، بەلام خەلك ناچێ ، چونکە گیاکە بەرزو بلیندو پڕە پێی تەڕ دەکا • کە ڕۆژ هەلات ،ارمێلکە ، دێنە دەرێ ، لەتەواوی ئەو دەورو پشتە دەنگی لێکدانی لەخە دارو گەلاّ دێتە بەر گوێ • لەبەهاردا بولبول لەسەر دارەکان دەست دەکەن بەنەغمە خوانی • بەردەکە لەسەری نەنووسراوە • هێندێك دەلێن : نووسرا بوو ، بەلام ڕەش بۆنەوە •

(( کۆتای ))



| لاپەڕە | دێڕ | هەڵە | ڕاست |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٥ | ٢٠ | چــۆ | چـوه |
| ١٩ | ٥ | حوكماتی دەكرد | حوكمی دەكرد |
| ٣٤ | ٢ | لە نـگاو | لە نـكاو |
| ٤٢ | ١٩ | غەضبە غەضب | غەڵبە غەڵب |
| ٤٩ | ١٣ | ڕین | راین |
| ٥٠ | ٩ | كێلی | كلیلی |
| ٥٠ | ١٧ | واو | وا |
| ٥٥ | ٦ | یەخر | یەحر |
| ٥٧ | ٢ | دووه | دەوه |
| ٦٤ | ٥ | كرـ | كرد |
| ٦٨ | ٢٢ | سه | سەر |
| ٦٩ | ١٩ | داو | دا |
| ٧٢ | ١ | ماوەیەك | پاش ماوەیەك |
| ٧٤ | ١٧ | نا | تا |
| ٧٩ | ١ | بو | بۆ |
| ٨٠ | ٣ | به | یه |
| ٨٥ | ١٠ | بكەو | بـكاو |
| ٨٧ | ١٨ | نه | به |
| ٩٥ | ١٣ | نرار | نرا |
| ١١٥ | ١٨ | بێست | پێست |
| ١٤٠ | ٧ | سۆڕ | شوڕش |
| ١٤٦ | ١ | و | وه |
| ١٥٣ | ١٢ | ده | دەوه |
| ١٦٢ | ١٠ | رەو | رەوه |
| ١٦٩ | ٥ | نا | تا |
| ١٧٠ | ١١ | كیله | كلیله |
| ١٧٩ | ٤ | با | یا |
| ١٨٦ | ١٦ | ته | نه |
| ١٩٤ | ١٤ | و | وه |
| ١٩٥ | ١٧ | مبه | مبەر |



## ژیانی فکتور هۆگۆ

- گەورەترین شاعیری فەرەنسی بوو لەسەدەی نۆزدەدا •
- لەشاری ( بیزنسمون ) لەساڵی (٨١٠٢)دا لە دایك بووە •
- یەکەم بەرهەمی کۆمەڵە شیرێك بوو بە ناوی سرود لەساڵی (١٨٢٢)دا بڵاوی کردەوە •
- لەساڵی (١٨٤١)دا کرا بەئەندامی ئەکادیمی یەی فەرەنسا •
- لەپاش مردنی لەساڵی (١٨٨٥)دا لاشەکەیان بردە (پانتیون) تا لە گەڵ پیاوە گەورە ناودارەکان بەیەکجاری سەر وەنێ •
- بەناوبانگترینی نوسراوەی (بێنەوایان) و (نوتردام)و (کرێکارەکانی بەحرە ) •
- بەڵام بەتایبەتی بەرهەمی شیعری پلەوپایەی زیاتر بەرزکردەوەو بردییە ڕیزی ئەدیب و شاعیرە بەناوبانگەکانی دنیاوە •
- لەبەرهەمی شیعری یەتی (گەڵای پایز) و (بیرکردنەوە)و چیرۆکی قەرنەکان •

---

چاپخانەی الحوادث ـ ت ٤١٥٢٦٨٥